زنجیرەی هزری هاوچەرخی ئیسلامی 17

أبو الأعلى المودودي

# چوار زاراوەکەی قورئان

خودا
پەروەردگار
پەرستن
ئایین

وەرگێڕانی
احمد محمد قەرەنی

پێداچوونەوەی
نجم الدين فرج أحمد

پێداچوونەوەی
أحمد وەرتی

چاپی دووەم

التفسير

## مەبەست لە زنجیرەی هزری هاوچەرخی ئیسلامی

- دەوڵەمەندکردنی کتێبخانەی کوردییە بە گرنگترین و کاریگەرترین دەقی ئەو کتێبانەی کە مرشتونی سەرینی هزری هاوچەرخی ئیسلامین .
- ئاشناکردنی خوێنەرو لاوی موسڵمانی کوردە بە دەقی ئەو کتێبانەی کە سەرچاوەن بۆ رۆشنبیری ئیسلامی و سازێنەری رابوونی ئیسلامین .
- شارەزاکردنی راستەوخۆی لاوی کورد بەم سەرچاوانە، ئازادکردنیان لە گشت کۆت و بەندو بۆچوونی تەسکی حزبایەتی و تاکرەوی و رەوتگەرایی .
- بناغەیەک بۆ بنیادنانی کەسایەتییەکی ئیسلامی بەهێزتر بۆ هەرتاکێکی موسڵمانی کورد، تا توانای ئەنجامدانی ئەو گۆڕانکاریانەی هەبێ، کە خوای پەروەردگار پێی سپاردوە .

دەگەڵ رێزو تەقدیرمان بۆ بیروڕای نوسەرانی ئەم زنجیرەیە، مەرجیش نیە ئێمە پابەندی هەموو بیروبۆچوونەکانیان بین .

با دەستووریشمان لە وەرگرتن فەرمایشتەکەی خوای پەروەردگار بێت:

ٱلَّذِينَ يَسۡتَمِعُونَ ٱلۡقَوۡلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحۡسَنَهُۥٓۚ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَىٰهُمُ ٱللَّهُۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمۡ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ﴿١٨﴾ سورة الزمر

ناوی کتێب بەکوردی: چوار زاراوەکەی قورئان
نوسینی: ئەبولئەعلای مەودودی
وەرگێڕانی: احمد محمد قەرەنی
بڵاوکردنەوەی: نوسینگەی تەفسیر بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن/ هەولێر
نەخشەسازی ناوەوە: جمعە صدیق کاکە
خەت: نەوزاد کۆیی
بەرگ: أمین مخلص
نۆرە و ساڵی چاپ: یەکەم ١٤٣٢ك – ٢٠١١ز
تیراژ: ١٥٠٠ دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی رۆشنبیری و هونەری هەولێر ژمارەی سپیاردنی ( ١٩٠ ) ساڵی ١٩٩٨ پێدراوە

تەفسیر
بۆ بڵاوکردنەوە و ڕاگەیاندن
هەولێر- شەقامی دادگا - ژێر هوتێلی شیرین پالاس
ت : ٢٢٢١٦٩٥ - ٢٢٢٠٩٠٨- ٢٥١٨١٣٨
مۆبایل : ٠٧٥٠ ٤٦٠ ٥١ ٢٢ - ٠٧٧٠ ١٣٨ ٧٢ ٩١
tafseeroffice@yahoo.com
tafseeroffice@maktoob.com
altafseer@hotmail.com

## بسم الله الرحمن الرحيم

انَ الحَمْدَ للهِ نَحْمَدُهُ ونَستعِينُهُ ونَستغفِرُهُ ، ونَعوذُ باللهِ من شُرورِ أنفُسِنا ومِن سَيئاتِ أعمالِنا ، مَن يهدِهِ اللهُ فلا مُضِلَ لهُ ، ومَن يُضلِلِ فلا هادِيَ لهُ . وأشهَدُ أن لا الهَ إلاّ اللهُ وأشهَدُ أنَ محمداً عَبدُهُ ورسُولُهُ.

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ﴾

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُوا۟ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءً ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ٱلَّذِى تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلْأَرْحَامَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا﴾

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَقُولُوا۟ قَوْلًا سَدِيدًا ﴿٧٠﴾ يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَـٰلَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا﴾

أمَا بعدُ : فإنَ أصدَقَ الحَديثِ كِتابُ اللهِ ، وخَيرَ الهَدي هَديُ محمدٍ ، وشَرَ الامُورِ مُحدَثاتُها ، وكلُ مُحدَثةٍ بدعَةٌ وكلُ بدعَةٍ ضَلالةٌ ، وكلُ ضَلالةٍ في النارِ .

به ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

# وتەیەکی پێویست

گومان لەوەدا نیە کە تێگەیشتنی لارو چەوت و هەڵە بەشداریەکی تەواوی لە دروست کردنی گومان و خوانەناسی و رەت کردنەوەی پەروەردگار و خودای تاقانەدا بەدرێژایی مێژوی مرۆڤایەتی کردوە.

لەراستیدا مرۆڤایەتیش لە ئەنجامی نەزانین و خوانەناسیو بێباوەڕیدا دوچاری چەندین جۆر لە نەخۆشی و بەدکاری و گومڕایی و سەرلێشێواوی بوە.. کێشەو ململانێی پێغەمبەران و نێردراوانی خواو بانگخوازانی بیروباوەڕیش بەرامبەر نەزانین و نەفامی، بۆ راست کردنەوەی چەمکی خواناسی و یەکتاپەرستی کێشەو ململانێیەکی دورو درێژو دژوار بوە.. چونکە لادان لە رێبازی خوا یاخود بەهەڵەو چەوت و لێ تێگەیشتنی، وا دەکات کە مرۆڤ لە شەوەزەنگی نەفامی وسەرگەردانیدا وێڵ ببێ ، یان لەبەر خۆیەوە دەست بکات بە ورێنەو لەناو شتی هیچ و پوچ و گومان و دڵەڕاوکێ و تێگەیشتنی ئاوەژودا بخولێتەوەو سەرگەردان ببێت..

بۆیە پێویستە چەمك و زاراوە ئاینییەکان لەپاڵ دیدو بیروڕاکانی ئەقیدەو ئایدیۆلۆژیدا وەك خۆیان بناسرێن و لێیان حاڵی ببین، واتە وەك مەبەست و ئامانجی دەقە ئیسلامییەکان دەیخوازن، نەك بە ویست وئارەزو، بۆ ئەوەی بە ئاوەژوکراوی تێنەگەین و سەرەنجامیش سەرمان لی تێك بچێ وسەرگەردان ببین.

هەر لەم سۆنگەوەو بۆ راست کردنەوەی ئەو تێگەیشتنە هەڵەیەی لە هەمبەر هەر یەکە لە زاراوەکانی (الله، الرب، العبادة، الدين) دا پەیدا ببو..

زانای پایەبەرز (ئەبو ئەعلا مەودودی) کەوتە خولیای هۆشیارکردنەوەی خەڵکی لە ڕێی ئەم کتێبەوە کە بەناوی (چوار زاراوەکەی قورئان) دایە، خودای گەورە پاداشتی بداتەوە.

مەودودی ڕەحمەتی خۆی لە پێشەکی کتێبەکەدا گرنگی وتێگەیشتنی ئەم چوار زاراوەی باس کردوە، بۆیە ئێمە لێرەدا ناچینە سەری وخوێنەری بەڕێز لەوێ دەیخوێنێتەوە..

هەر ئەم گرنگییەی زاراوەکان و شێوازی کتێبەکەش وای کردوە کە بۆ چەندین زمان وەربگێڕدرێ.. بۆیێ برای بەڕێزمان مامۆستا (ئەحمەد قەرەنی) ئەرکی وەرگێڕانی بۆ سەر زمانی کوردی خستە ئەستۆ، تا خوێندەواری کوردیش لێی بەهرەمەند ببێ ..

پێویستە بگوترێ کە بەندە پێش ماوەیەکی زۆر دەستم دایە وەرگێڕانی ئەم کتێبەو قەدەرێکی باشم لی وەرگێڕا، بەڵام دوای بینینی بەڕێز مامۆستا (مخلص) لە نوسینگەی تەفسیرو ئاگادار بون لەوە کە کتێبەکە لای ئەوان وەرگێڕانەکەی تەواو بوە وا بە چاك زانرا کە بەندە ئەرکی پێداچونەوەی بگرمە ئەستۆو بیکەین بە یەك وەرگێڕان.

منیش ـ لەگەڵ سوپاس و پێزانینم بۆ ئەو بەڕێزانە ـ هەستام بەو کارەو ئەوەی پێویست و لە توانای مندا بو بە ئەنجامم گەیاند، چونکە لە ڕاستیدا ئەم کتێبە کتێبێکی ئاسایی نییەو بەرهەمێکی زۆر نایابە، بۆیە هەڵدەگرێ کە چەندین جار وەردبکرێتەوەو پێداچونەوەی لەسەر بکرێت، بەڵکو بە وەرگێڕدراوی جارێکیتر ئەو ئامانجە بپێکێ کە یەکەم جار بۆی دانراوە ـ إن شاء الله گەر لە شوێنێکیشدا شتێکم لە پەراوێزدا زیادکردبێت بە (ئە.و) ئاماژەم پێداوە.

بە پێویستیشم زانی کە کورتەیەکی ژیانی مامۆستا مەودودی بنوسم و بیخەمە سەرەتای کتێبەکەوە.

هیوادارم کە کتێبێکی خنجیلانەی کوردی لێ دەربچێ و خوێنەران لێی بەهرەمەند بن و جارێکیتریش ئاواتی مامۆستا مەودودی لەناو گەلی کوردی مسوڵماندا بێتە دی.

داواکاریم لە خوێنەرانی بەڕێز کە بە وردی کتێبەکە بخوێننەوەو نزایەکی خێریش بۆ دانەرو بۆ ئێمەش بکەن.

لە کۆتاییدا هیوای سەرکەوتن و پێشکەوتن بۆ برای وەرگێڕو نوسینگەی تەفسیر دەخوازم ..

ئەحمەد وەرتی

. هەولێر ١٣/شەعبانی ١٤٢١ کۆچی

٩/ تشرینی دوەمی ٢٠٠٠ زایینی

# پێشەکی وەرگێڕی کوردی

سوپاس و ستایشی بێپایان بۆ خـودای جیهانیـان، درودو سـەلام و بـەرەکاتی خـودا بـڕژێ بەسـەر گیـانی پـاکی (موحەممـەد) و یـارانی و شـوێنکەوتوانی تـا رۆژی دوایی..

لەپاشان..

هەمو بیروبۆچونێك کاتێ تەمەنی گەورە دەبێ وبە هەر چوار دەوری جێ پەیدا بونیدا بڵاوە دەکا، زۆر تۆزو گەردی لی دەنیشێو شـتی تـری پێـوە دەلکێ، جا یـا بـە هـۆی ناحـاڵی بـون لـەو دەق و مانـاو مەبەسـتانەی ئـەو بیروبۆچـونە هەیەتی یا بەکارهێنانی لەلایەن هەلپەرستانەوە بەپێی مرادو مەبەستی خۆیان بێ.

بەهەمان شێوە بەرنامەی ئیسلامیش کە خودای گەورە ﷻ لە نیومدورگەی عەرەبیـــدا ناردیـــە خـــوارەوە، خـــەڵکانێکی زۆرو زەبەنـــدە لـــە هـــەمو رەگـــەزو زمانێکدا هاتنە ناویەوەو هەڵیان گرت، لە ئەنجامدا زۆر تۆزو گەردی لـی نیشت و زۆرجـار خـەڵکی ئیسـلام لـە ئـامێزگرتو بیروبۆچـون و فەلسـەفەو رۆشـنبیری خۆیان تێکەڵ بەو ئایینە نوێیـە دەکـرد، بۆیـە خـودای گـەورە سوننەتی وایـەو پێغەمبـەری پێشـەواش ﷺ ئامـاژە بـۆ ئـەم مەسـەلەیە دەکـاو دەفـەرموێت: (لەسەری هەر سەد ساڵێکدا خـودای گـەورە یـەکێك شـیاو دەکـات کـە ئـەو تـۆزو گەردەی لەو ئایینە نیشتون داتەکێنێ و کاکڵەکەی بخاتە بەرچاوی خەڵك).

هەر لەم روانگەو رێگایەوە مامۆسـتا مـەودودی رەحمـەتی سـەیری کـرد کـە خـەڵکی زۆری چـەمکەکانی دیـن بـە ئـارەزو تێدەگـەن، شـتیان لـی زیـادو کـەم کـردوە، تـا سـەری لـەوە دەرچـو کـە چـەمکە ئایینیـەکان ئـەو رۆڵـەی هـەیانبو

نەیانماو کاریگەریان لە نێو میللەتی ئیسلامدا کز بو، بۆیە بەپێویستی زانی وەکو نوێخوازێکی ئەم سەدەیەی رابرد راپەڕێ و ئەو چەمکانە لە هزری خەڵکدا راست کاتەوەو حاڵیان بکات.

وەکو خۆی رەحمەتی لێبێ لە نێوەڕۆکی ئەم کتێبەدا دەفەرموێت: کە بانگەوازی قورئان لە دەوری ئەم چوار زاراوەیە دەسوڕێتەوە، ئەمانەش خەڵکی لە ژیانی دنیادا دایان بڕیوەو بۆچونەکەیان تەسك کردۆتەوە.. بۆیە کتێبێکی تەواوی تەرخان کرد بۆ رونکردنەوەیان..

ئێمەش دەبینین ئەوەی لەوێ هەبوە لێرەش بە هەمان شێوە خەڵکی ئەو زاراوانەیان تەسك کردۆتەوە یان لەبیریان چۆتەوە، یا لە دنیای عیلمانی ئەمڕۆدا لە ژینی دنیا دابڕاوە، بۆیە بەپێویستمان زانی کە خوێنەرانی زمانی کوردی پێ ئاشنا بکەین و میللەتی کوردیش ئاورێك لە دینی باو باپیریدا بداتەوەو بەراستی لێی حاڵی بێ و بیکا بە سارێژکەری زام و نەهامەتیەکانی رۆژگاری ئەمڕۆی، هەروەها کتێبخانەی کوردیش بەم کتێبە دەوڵەمەند کەین.

لە خوداش دەپاڕێینەوە کە هەڵەکانمان داپۆشێ و ئەم هەوڵەشمان بخاتە تای تەرازوی چاکەکانمان بۆ رۆژێك کە بنیادەم پێویستی بە گەردیلەیەك چاکە هەیە.

وە خودا باشترین سەرپەرشتیارو پشتیوانە.

ئەحمەد قەرەنی

٢٩ی زوالقعدەی ١٤٢٠

٢ی ئـــازاری ٢٠٠٠

هەولێر

## پێناساندنێك [1]

سوپاس بۆ خودا، درودی پاك و لێزمـه بارانی بـه‌زه‌یی خـودا بـڕژێ بـه‌سـه‌ر گیانی پاكی پێغه‌مبه‌ره به‌ڕێزه‌كه‌ی (موحه‌ممه‌د ﷺ).

ئه‌م كتێبـه ماموٚستای بـه‌ڕێز ئه‌بوئـه‌علای مـه‌ودودی كـه لـه سـاڵی (١٣٦٠ی كۆچـی -١٩٤٠ی زایـینی ) داینـاوه و به‌شـه‌كانی یـه‌ك لـه‌دوای یـه‌ك لـه گۆڤـاره مانگانه‌ییه‌كه‌یدا كه ناوی (ترجمان القران) بو بـلاو كردۆتـه‌وه. ئینجا هـه‌موی له كتێبێكدا كۆكرده‌وه‌و به‌ناوی (المصطلحات الاربعة في القرآن) چاپی كرد.

ماموٚستا له پێشه‌كی ئـه‌م كتێبـه‌دا باسـی كتێبه‌كـه‌و گرنگـی زاراوه‌كـانی لـه ئیسلامدا كردوه، له‌بـه‌ر ئـه‌وه پێویست ناكات لێـرمدا دوبـاره بكرێتـه‌وه، تـه‌نها ئه‌وه نه‌بێ كه باسی هۆی دانانی كتێبه‌كه‌و ساڵی نوسینی بكه‌ین.

ئه‌م كتێبـه له‌ساڵی ١٩٤٠ ز ١٣٦٠ی كۆچـی دانـراوه، ئـه‌و سـاڵه‌ش هاوكـات بـو له‌گه‌ڵ دامه‌زراندنی كۆمه‌ڵه‌ی ئیسلامی (الجماعة الاسلامية) له هیندستان. ئه‌م كتێبـه رۆڵێكـی باشـی هـه‌بو لـه رونكردنـه‌وه‌ی بانگـه‌وازی ئـه‌و كۆمه‌ڵه‌یـه‌و هه‌ڵوێسته‌كانیان به‌رامبه‌ر به تاقم و پێڕه‌كانی ئه‌و ناوچه‌یه.

جا له‌وه‌دوا هه‌ر كه‌سێك هاتبایه ناو ئه‌و كۆمه‌ڵه‌یه ده‌یزانـی جیـاوازی ئـه‌و كۆمه‌ڵه‌یـه له‌گـه‌ڵ بانگـه‌وازی تـاقم و پێڕه‌كـانی دیكـه‌دا چـیه. هـه‌ر چـه‌نده هه‌ندێكیان داوای ئه‌وه‌یان ده‌كرد كه بۆ ئیسلام و بلاوكردنه‌وه‌ی بانگه‌وازه‌كـه‌ی دامه‌زراون.

تا ئێستا[1] ئه‌م كتێبه چوار جار به‌زمانی ئوردۆ چاپ كراوه، هه‌ر جاره‌ی سێ

---

[1] ئه‌مه پێشه‌كیه عه‌ره‌بیه‌كه‌ی كتێبه‌كه‌یه.

هەزار (٣٠٠٠) دانەی لێ چاپ کراوە. تا ئەمڕۆ بۆ هیچ زمانێك وەرنەگێڕدراوە، تەنها ئەوە نەبێ کە برای ئەدیب و خێرخواز (موحەممەد کازم سەبباق) کە لە هاوڕێیانی (دار العروبة الاسلامية)یە بۆ عەرەبی وەری گێڕاوە.

وە ئێمەش خۆمانی لێ بەهرەمەند دەکەین بەپێشکەش کردنی بۆ ئەوانەی بە پیتی (ض) دەدوێن[٢].

ئەم کتێبە دوەمین کتێبە کە لەدیمەشقی قەڵای سەختی ئیسلام بەدەستی برایانی ئایین و زانستپەروەر چاپ دەکرێت، کە دڵمان لەسەر خۆشەویستی ئیسلام و قوربانیدان لەپێناویدا لەگەڵیاندا کۆبۆتەوە.

خودا هەمومان ڕێنمونی بکاو سەرمان بخات بۆ کارێك کە خۆی پێی ڕازیە، هەر ئەو سەرپەرشتیارو پشتیوان و بیسەرو وەڵامدەرەوەی پێویستیەکانمانە.

پێش ئەوەش لەدیمەشق کتێبی (مبادیء الاسلام)ی مامۆستا مەودودی چاپکراو هەشت کتێبی دیش لە قاهیرە چاپکراوە..

دوا وشەشمان هەر سوپاس و ستایشە کە بۆ خودای پەروەردگارە.

موحەممەد عاسم حداد
لاهور / پاکستان
١٣ی جەمادی یەکەم ١٣٧٤ی ك.
٨ی کانونی دوەم ١٩٥٥ی ز

---

[١] مەبەستی ساڵی ١٣٧٤ك - ١٩٥٥ز، هاوکات بەنوسینی ئەم پێشەکیە.

[٢] مەبەست عەرەبەکانە. بۆیە بەو پیتە دەناسرێنەوە چونکە پیتێکی گرانە لەسەر زمان، بێ گومان ئێستا کتێبەکە بۆ زیاتر لە ٣٠ زمانی جیهان وەرگێڕراوە .

## ئەبولئەعلای مەودودی لە چەند دێڕێكدا(*)

لە بەرەبەیانی رۆژی دوشەممەی ٣ ی رەجەبی ١٣٢١ی كۆچی بەرامبەر بە ١٩٠٣ی زایینی لە شاری (ئۆرنگ ئاباد)ی هیندستان لە خێزانێكی ئایین پەروەر لەدایك بوە، باوكی ئەبولئەعلا (ئەحمەد حەسەن مەودودی) پیاوێكی پارێزكارو خواناس بو كە بۆ خزمەتكردنی ئایینی ئیسلام كاری رۆژنامەگەری هەڵبژاردبو..

- تا تەمەنی (٩) ساڵی كتێبەكانی سەرەتای قۆناغی خوێندنی لای باوكی بەرێزی خوێندوە، پاشان لە قوتابخانەی (فەوقانیە)ی ئۆرنگ ئاباد دا بە خوێندن وفێربونی قۆناغی سەروتر لە خوێندنەكەیدا خەریك دەبێ، تا تەمەنی (١٥) ساڵی لەو قوتابخانەیەدا لە زانستەكانی تەفسیر، فەرمودە، فیقه، ئوسول، رەوانبێژیی، وێژە، سەرف، نەحو، ماتماتیك .. بەشێوەیەكی زۆر چاك بەهرەمەند بوە.. ئەو كاتە كتێبی (المرآة الجدیدة)ی لە عەرەبییەوە بۆ سەر زمانی ئوردو وەرگێڕاوە.
- لە ساڵی ١٩١٨ز تا ١٩٢١ز لە رۆژنامەی (تاج) بەشداری كردوە كە لە (جبل پور) لە هیند چاپ و بڵاودەكرایەوە.

---

* بۆ نوسینی ئەم چەند دێڕە لە ژیانی مەودودی، سود لەم دو كتێبە وەرگیراوە : (پێشەكی وەرگێڕراوی فارسی ئەم كتێبە كە (سعید بهبودی) وەریگێڕاوە، هەروەها كتێبی (أبو الأعلى المودودي، حیاته ودعوته/ ألیف الدین الترابي).

- لەساڵی ١٩٢١ز دەڕواتە شاری (دەلهی) و لەوێ دەبێتە سەرنوسەری هەردو ڕۆژنامەی بەناوبانگی (مسلم) و (الجمعیة) کە ئۆرگانی ناوەندی (کۆمەڵەی زانایانی هیند) بون، هەر لە سەردەمی ئەمدا (الجمعیة) ناوبانگێکی زۆری پەیدا کرد.
- لەساڵی (١٣٥٢ك-١٩٣٣ز) بۆ خزمەتی زیاتری ئیسلام کاری ڕۆژنامەگەری دەست پێدەکات و گۆڤاری (ترجمان القرآن) وچەند کتێب ونامیلکەیەکی تر بڵاودەکاتەوە.
- ساڵی (١٣٥٩ك) کاری بانگەوازی ئیسلامی خۆی زیاتر پەرە پێداو پاشان لەگەڵ ڕۆژنامەیەکی بەناوبانگی ئوردوزماندا هاوکاری دەکات.
- لەو کات و ساتانەشدا بو کە مەودودی روی لە سیاسەت کردو بەشداری لە بزوتنەوەی (خیلافەت) دا کردو لەگەڵ بزوتنەوەی (تەحریکی هیجرەت) یشدا هاوکاری هەبو.
- لەسەر داوای چەند جارەی زاناو دانای خۆرهەڵات (محمد ئیقبال لاهوری) لە (حەیدەر ئابادی دکن)ەوە دەچێتە ناوچەی (پەنجاب) بۆ ئەوەی لە بەرەوپێش بردنی شۆڕشی ئیسلامی و ناساندنی سیماو روخساری ئیسلامی راستیدا نەخش و رۆڵی کاریگەر ببینێ، وە لە (دار الاسلام) نزیك شاری (پتانکوت) نیشتەجێ دەبێ و لەوێ ناوەندێکی رۆشنبیری و لێکۆڵینەوەی گرنگ پێك دەهێنێت وبەهاوکاری فەیلەسوف بەرێز (ئیقبال لاهوری) بۆ پێگەیاندنی زانایانی ئیسلامی، لێکۆڵەرەوان وزانستخوازانی خەمخۆر لەپێناو راژەو ناساندنی هەقیقەتی ئایینی ئیسلامی پیرۆز هەوڵ وکۆشش و هیممەتی زۆری بەخەرجدا

- لەســـاڵی (١٣٦٠ك-١٩٤١ز) كۆمەڵـــەی ئیســـلامی (الجماعـــة الاســـلامية)ی دامەزرانـــدوە، هـــەر لـــەو ساڵەشـــدا كتـــێبی (چـــوار زاراوەكـــە (المصـطلحات الاربعة)ی داناوە.
- دوای ئـــەوەی لـــەم ســـەدانەی دوايیـــدا خـــەڵكی بەرەبـــەرە لـــە ئیســـلام و ڕێنماییيـــەكانی دوركەوتنـــەوەو مۆســـقۆفی ئیلحـــادی و بێبەنـــد وبـــاری لـــە وڵاتـــانی ئیســـلامیدا بڵاوبويـــەوە ئـــەو كاتـــە گـــەورەپیاوی مێـــژوی ئیســـلام (جـــەمالوددينی ئـــەفغانی) هـــات و پـــەيامی ئـــاگرين و كاريگـــەرە ئیسلامی و شۆڕشگێڕيەكەی دا بە گـوێی خـەڵكا و جـارێكیتر ئوممـەتی ئیسلامی وريـا كـــردەوە لـــە نەخشـــەو پلانـــەكانی دوژمنـــان، دوای ئـــەويش بـــانگخوازان و پەرچـــەمدارانی گـــەورەی وەك پێشـــەوا (حســـن البنـــا) و (ئـــەبو لئـــەعلا) و (سـەييد قوتـب) ڕێبـەرايەتی بزافی شۆڕشـگێڕی ئـەو قوتابخانەيـەيان گرتـە دەست و لە پێناويدا گيانبازی و فیداكاريیان نواند.. كە بـزاڤ و ڕاپـەڕين و ســـەرهەڵدانەكانی ئیســـلامی لـــە جیهـــانی ئیســـلامیدا لـــەم چاخـــەی ئێســـتادا دوای فەزڵی خودای گەورە بـەرو بەرهـەمی ڕەنـج و مانـدوبون و جیهـاد و تێكۆشانی ئەوان و هاو وێنەكانیانە.
- ئەبو ئەعلای گـەورەپیاوی گۆڕەپـانی خـەبات و تێكۆشـان دژی خـەرافات و ڕێچكە مرۆڤ كردە خۆرهەڵاتی و خۆرئاوايیەكان، تەمـەنی بـەنرخی خـۆی لە لێكۆڵینەوەو نوسـینی بەرهەمـە نايـاب و بەنرخـەكانی زانسـتی، سیاسـی ورۆشـنبیری زياد لەسەدو ئەوەندەی (كتێب و ناميلكە) دا بردە سەر.
- زانايـان و نوسـەران ئـەمڕۆ تەفسـیری (تفهـيم القـران) ی ئـەبو لئـەعلای مەودودی و تەفسیری (في ظلال القرآن)ی مامۆستای شەهید سـەييد قوتـب بە زمانە زيندوەكانی جیهان گوزارشت لێدەكەن.

- سـەرەنجام ئەبولئـەعلا دوای خزمـەتێكی زۆری بـە ئیسلام ومسولْمانان و هۆشـیار كردنـەوەیان وراسـت كردنـەوەی تێگەیشـتنە چـەوت و هەڵـەكان.. ساڵی (١٣٩٩ك - ١٩٧٩/٩/٢٢ز) بۆ دواجار ماڵئاوایی لەم جیهانە پڕ لە تەنگ و چـــەڵەمەیە كـــرد و بـــەرەو لای خـــودای گـــەورە گەڕایـــەوە، وە لـــە (ئەچهەرە)ی لاهوری پاكستان ئەسپەردەی خـاك كـراو ئێستا ئارامگاكـەی لەوێیە.

سلاْوی خوا لە گیانی پاكی و جێگـای بەهەشـتی بـەرین و ڕێگاكەشـی پـڕ لـە ڕێبوار بێت.

﴿ وَٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ فِينَا لَنَهۡدِيَنَّهُمۡ سُبُلَنَاۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَمَعَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴾

بسم الله الرحمن الرحيم

# پێشەکی دانەر

ئـەم چـوار زاراوەیـە: (الله) خـودا، (الـرب) پـەروەردگار، (العبـادة) پەرسـتن، (الدين) ئايين، بناغـەو بنچينەی زاراوەکانی قورئـانن و بانگەوازی قورئـان لـە دەوری ئەم چوار زاراوەیە دەسورێتەوە. بەگشتی قورئان داوای ئـەوە دەکات کـە خودای پەروەردگار تاك وتەنيايەو خۆی هەڵسورێنەری ئەم بونەوەرەیەو هەمو کەس پێويستی بەوەو ئەو پێويستی بەکەس نيە، هـيچ خودايـەکی بەهـەق نيـە تەنها ئەو نـەبێ.. مرۆڤ دەبێ تەنها بە خودايەتی ئەو رازی بێ و بەس، ئەو بـە پەروەردگار بناسێت و بگرێ و خودايەتی و پەروەردگاريەتی غـەيری ئـەو رەت بکاتەوە.. بە تەنها ئەو بپەرستێ وغەيری ئەو نەپەرستێ.. تـەنها ئـايينی خـودا بـە پـوختی بگـرێ و هـەمو ئـايينێکی غـەيری ئـايينی خـودا رەت کاتـەوە، وەك دەفەرموێ:

﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِيٓ إِلَيۡهِ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعۡبُدُونِ﴾

الانبياء/٢٥ واتـە: لـە پـێش تـۆدا هـيچ پێغەمبـەرێکمان نـەناردوە ئـيللا سـروش (وەحی) مان بۆ کردوە کـە: جگـە لـە مـن پەرسـتراوێکی تـر نيـە، دەسـا ئێـوەش بەندايەتی تەنها من بکەن.

وە دەفـــــەرموێت: ﴿وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُوٓاْ إِلَٰهًا وَٰحِدًاۖ لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۚ سُبۡحَٰنَهُۥ عَمَّا يُشۡرِكُونَ﴾ التوبـة/٣١ واتـە: فـەرمانيان تـەنها بـەوە پـێ کرابو کە تەنها يەك خوا بپەرستن، کە هيچ خودايەکی تر جگە لەو نيە، پاك و

بێ خەوشی بۆ خوا لەو هاوبەش پەیدا کردنەی کە بۆی دەکەن..

دەفـــــەرموێت: ﴿ إِنَّ هَٰذِهِۦٓ أُمَّتُكُمۡ أُمَّةً وَٰحِدَةً وَأَنَا۠ رَبُّكُمۡ فَٱعۡبُدُونِ ﴾ الانبيـاء/٩٢ واتــە: بێگومـان ئـا ئەمـە بەرنامــەو ئوممــەتی ئێومیــە[١] کــە تاکــە ئوممەتەو منیش پەروەردگارتانم و دەی سا تەنها بەندایەتی من بکەن.

هــەروەها دەفــەرموێت: ﴿قُلۡ أَغَيۡرَ ٱللَّهِ أَبۡغِي رَبّٗا وَهُوَ رَبُّ كُلِّ شَيۡءٖ﴾ الانعـام/١٦٤ واتە: بڵێ چما دەبێ جگە لە (الله) پەروەردگارێکی تـر بخوازم و بیپەرستم؟ لەکاتێکدا کە ئەو پەروەردگاری هەمو شتێکە؟

یـــان کـــە دەفــەرموێت: ﴿فَمَن كَانَ يَرۡجُواْ لِقَآءَ رَبِّهِۦ فَلۡيَعۡمَلۡ عَمَلٗا صَٰلِحٗا وَلَا يُشۡرِكۡ بِعِبَادَةِ رَبِّهِۦٓ أَحَدَۢا﴾ الكهـف/١١٠ واتــە: جـا هەرکەسێك بــە تــەمای دیـدارو پێـك گەیشتنی پەروەردگاریەتی با کردەوەی چاك ئـەنجام بـدات و هاوبـەش بـۆ خـوا دانەنێت.

یـــان: ﴿ وَلَقَدۡ بَعَثۡنَا فِي كُلِّ أُمَّةٖ رَّسُولًا أَنِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَٱجۡتَنِبُواْ ٱلطَّٰغُوتَ ﴾ النحـل/٣٦ واتــە: لـەنێو هــەر نەتەوەیەکـدا پێغەمبــەرێکمان نـاردوە (تـا پێیـان رابگەیەنن) کە: بەتەنها خودا بپەرستن و لەتاغوت(هەر یـاخی و پەرستراوێکی تری غەیری خوا) دور کەونەوە.

وە دەفـــــــەرموێت: ﴿أَفَغَيۡرَ دِينِ ٱللَّهِ يَبۡغُونَ وَلَهُۥٓ أَسۡلَمَ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ طَوۡعٗا وَكَرۡهٗا وَإِلَيۡهِ يُرۡجَعُونَ ﴾ آل عمـــران/٨٣ واتـــە : ئایـــا

---

[١] ئیبنو عەباس دەفەرموێت: (امە) بەمانای ئایین هاتوە. واتە ئەمە ئایینی ئێومیە کە یەك ئایینەو هەموتان لەسەرین.

ئـەهلی كیتـاب (جولەكـەو دیانـەكان) ڕێبـازێكی دی بێجگـە لـە ڕێبـازی خـودا دەخوازن؟ لە كاتێكدا هەرچی لە ئاسمانەكان و زەویدایە ، بە خۆشی خۆیان بێ یا بەناچاری ملكەچی ئەون و هەر بۆ لای ئەو دەگەڕێنەوە.

دەفەرموێت: ﴿قُلْ إِنِّيٓ أُمِرْتُ أَنْ أَعْبُدَ ٱللَّهَ مُخْلِصًا لَّهُ ٱلدِّينَ﴾ الزمر/١١ واتـە: بڵـێ مـن فـەرمانم پێكـراوە كـە تـەنها خـودا بپەرسـتم و بەدڵسـۆزی و سەرڕاسـتیەوە دینداریی بۆ بكەم و لەسەر دینەكەی بم.

یـــان دەفـــەرموێت: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ رَبِّي وَرَبُّكُمْ فَٱعْبُدُوهُ هَٰذَا صِرَٰطٌ مُّسْتَقِيمٌ ﴾ آل عمران/٥١ واتە: خودای گەورە پەروەردگای من و ئێوەشـە، دەی دەسا هـەر ئـەو بپەرستن، ئا ئەوەش ڕێبازی راست..

ئەمانـە چـەند ئایـەتێك بـون بـە نمونـە هێنامانـنـەوە، دەنـا ئـەوەی قورئـان بخوێنێتـەوەو تێـی بگـا، هـەر زو هەسـت دەكـا بـەوەی كـە هەرچـی ڕێنمـونی و ئامۆژگاری قورئـان هەیـە لـە دەوری ئـەم چـوار زاراوەیـە دەسوڕێتەوەو بابـەتی قورئان و دیدو فیكرە بنەڕەتیەكەی لەوە زیاتر نیە كە:

١- تەنها خودای گەورە پەروەردگارو پەرستراوە.

٢- جگە لە خودای گەورە هیچ پەروەردگارو پەرستراوێكی تر نیە.

٣- دەبێ مرۆڤ تەنها خودای گەورە بپەرستێت.

٤- دەبێ تەنها ئایینی خودای گەورە بە پوختی و پاكی وەك بەرنامەی ژیانی مرۆڤ پەیڕەو بكرێ و دینداریش تەنها بۆ وی یەكلا بكرێتەوە.

## گرنگی ئەم چوار زاراوەیە

ئـەوەی رون و ئاشـكرایە ئەوەیـە: کـە ئـەو کەسـەی لـە قورئـان بکۆڵێتـەوەو بچێتە بنج و بناوانی ماناکانیەوە ، دەبێ لە مانـای ئـەم چوار زاراوەیـە بگـات و چەمکە تـەواو گشتگیرەکانی وەرگرێـت . چونکە[١] ئـەوەی نـەزانێ مانـای خـودا (الله) و پـەروەردگار (الـرب) و پەرسـتن (العبـادة) چیەو ئـایین (الـدین) بۆچـی بەکار دێت؟ ئەوا گومان لەوەدا نیە قورئان لای ئەو دەبێتە قسەیەکی پشتگوێ خـراو هـیچ لـە ماناکـانی تـێ ناگـات، و نـاتوانێ راسـتی یەکتاناسـی بزانـێ، یـا بنەچەی هاوەڵ پەیداکردن پێبزانێ! یـا نـاتوانێ پەرستنەکەی تـەنها بـۆ خـودا بێت و دین و دینداریەکە بە پـوختی بگرێتـە بـەر.. هـەروەها ئەگـەر چەمکی ئەم زاراوانە لە زەینی مرۆڤدا رۆشـن نـەبو، کـەموکورتی هـەبو لـە تێگەیشتنی ماناکانـدا، ئـەوا بێگومـان هەرچـی رێنمـونی و ئامۆژگـاری قورئـان هەیـە لێـی تێکەڵ دەبێ و عەقیدەو کردەوەکانی هەموی کورت هەڵدێنێ و لـە کاتێکدا کـە باوەڕی بە قورئانەکەش هەیەو بـەردەوام (لا الـه الا الله)ی لەسـەر زمانـە، بـەڵام خوداوەندی دیکە جگە لە خودای گەورە دەپەرستێت!! هەر لاف ئـەوەش لێـدەدا کـە غـەیری (اللـه) هـیچ پـەروەردگاری دی نیـە، کەچـی لـە واقیعـدا ملکەچـی پەروەردگاری دیکەیە! بە هەمو راستگۆیی و دڵسۆزیەوە رادەگەیـەنێ کـە تـەنها (الله) دەپەرستێ و ملکەچی بۆ ئەو نەبێ بۆ کەس ناکا، لەگەڵ ئەوەشدا ملکەچ و گوێڕایـەڵی زۆر خوداوەنـدی تـرەو جگـە لـە خـودای گـەورە (اللـە)ی کردۆتـە سەیدو سەروەری خۆی! هەروەها بە هەمو هێزو توندی خۆی رادەگەیەنێ کەوا لە چوارچێوەی ئایینی خودادایەو باوەشی پێدا کردوەو دینـدارە، ئەگـەر کەسـێ

---

[١] بە وردی سەرنجی ئەم وتانەی مامۆستا مەودودی رەحمەتی بدە. (ئە.و)

بلێ تۆ لەسەر ئایینێکی تری، شەڕی لەگەڵدا دەکا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە ئاینێکی تردایەو خۆی بە چمکی چەند ئایینێکەوە هەڵواسیوە.

بێگومان بە زمان لە (الله) نەبێ لە کەس ناپاڕێتەوە.. بە کەسیش نالێ خوداو پەروەردگارمە، بەڵام بە گوێرەی ئەو مانایانەی بۆ هەردو وشەی خوداو پەروەردگار دانراون چەندین خوداوەندو پەروەردگاری تری هەن. ئەو داماوە نازانێ کە جگە لە (الله) خوداوەندو پەروەردگاری دیکەی بە هاوەڵی داناوە، ئەگەر ئاگاداریشت کردەوە کە غەیری (الله) دەپەرستێ و لە دینی خودادا هاوەڵی بۆ خودای گەورە بڕیارداوە، ئەوا بێگومان بە روتدا هەڵدەستێتەوەو پەلامارت دەدات.. بەڵام ئەوە حاڵێتی ! لە راستیدا بە گوێرەی کاکڵەی ماناو واتای (پەرستن) و (ئایین) ئەو غەیری (الله) دەپەرستێ و چوەتە نێو ئایینێکی دیکەوە! نازانێ لەگەڵ ئەو هەمو چاکانەی کە دەیکا لە پەرستنی غەیری (الله) دایەو ئەو رێبازەی ئەو گرتویێتیە بەر ئایینێکە خودا رێی پێ نەداوە و هیچ بەڵگەیەکی راستی لەسەر دروستیی نییە..

## هۆی سەرەکی ئەم تێگەیشتنە چەوتە

تێڕوانین لە چەرخی نەفامی و چەرخە ئیسلامیەکانی دوای ئەو، دەمانگەیەنێتە ئەوەی کاتێ قورئان دابەزیە سەر عەرەبەکان و بەوانە راگەیەنرا کەوا بە پیتی (ض) دەدوێن، هەمو کەسێ لەوان دەیزانی مانای (الە) چیەو مەبەست لە وشەی (الرّب) چیە؟ چونکە لەمێژ بو ئەو دو وشەیە لە ناویاندا بەکار دەهات و شارەزای هەمو ئەو مانایانە بون کە ئەو دو وشەیە دەیانگرتنە خۆیان. بۆیە ئەگەر پێیان گوترابا ( لاالە الا اللە) واتە هیچ پەرستراوێ نیە تەنها (اللە) نەبێ کە هیچ هاوبەشێکی لە خودایەتی و

پەروەردگاریدا نیە، ئەوا بـە تـەواوی دەیـانزانی بانگهێشتی چی دەکـرێن و بـێ لێتێکەڵ بون و تەمومژ بۆیـان دەردەکـەوت کـە گۆتیـار (قائـل) نـەفی چ شـتێکی کردوەو نەیهێشتوە غەیری خودای پێ وەسـف بکـرێ و چ شـتێك تایبـەت کـراوە بە خوداو پاك و پوختە کراوە بۆی.

جا ئەوانەی دژایەتیان دەکرد بە رێرونییـەوە دژایـەتیان دەکـردو دەیـانزانی کە خودایەتی و پەروەردگاریەتیان داوەتە پاڵ غەیری (الله) و کوفرەکـەیان بـە چـی هەڵدەوەشـێتەوە. هـەروەها ئەوانـەی باوەڕیـان هێنـابو بـە زانـین و رێرونییەوە باوەڕیان هێنابو بە هەمو ئەو شتانەی کە ئـەو عەقیدەیـە زیادەیـە پێویستی دەکات وەربگیرێ یا لە خۆ دارنرێ و وازی لێ بهێنرێت.

هەروا وشەکانی (العبادة) و (الدین) لە زمانەکەیانـدا بـاو بـون و دەیـانزانی بەندە (عبد) چیەو بەندایەتی (عبودیة) چی دەگەیەنێ و ئەو پەیڕەوە کردارە چیە کە پێی دەڵێن (العبادة) وە کاکڵەی (الـدین) چیەو ئـەو مانایانـە چین کـە ئەو وشەیە دەیانگەیەنێت.

بۆیە کاتێ کە پێیان دەگـوترا (خـودا بپەرسـتن و لـەتاغوت دور کەونـەوە) و وەرنـە نـاو ئـایینی خـوداو واز لـە هـەمو ئـایینێ بهێـنن، لـە حـاڵیی بـون لـەو بانگـەوازەی قورئـان هێنـابوی بـە هەڵـەدا نەچـوبون، هـەر لەگـەڵ وشـەکانی بـەرگوێیان کـەوت یەکسـەر زانیـان ئـەو بانگـەوازە داوای چ گۆڕانکاریـەکیان لـە شێوازی ژیانیاندا لێ دەکات.

بەڵام لە چەرخەکانی دوای چەرخی زێڕینی پێغەمبـەر ﷺ و هـاوەڵانی مانـا رەسـەن و راسـتەکانی ئـەم وشـانە بەرەبـەرە گۆڕانیـان بەسـەردا هـات، ئـەو مانایانەی کە لەسەردەمی دابـەزینی قورئانـدا لـەناو ئـەو نەتەوەیـە بـاوبون، تـا وای لێهات هەر یـەك لـەو چوار زاراوەیـە بـە چـەند مانایـەکی تەسـك سنوردار

كران لەچاو ئەو مانا فراوانەی پێشتر دەیانگرتە خۆو كورت هەڵهاتن! لە چەند مانایەكی دیاریكراوی سنوردار و تەسك و تایبەتەوە كران بە چەند شتێكی شاراوە، ئەویش لەبەر دو هۆ:

١- كەم بونی چێژی زمانی عەرەبی تەواو و وشك بونی كانیاوی زمانی عەرەبی لە چەرخە دواییەكاندا.

٢- ئەوانەی لەوەدوا لە كۆمەڵگای ئیسلامی لەدایك دەبون و تیایدا پێ گەیشتن، واتاو مەدلولی ئەو مانایانەیان بۆ نەمابوەوە لە وشەكانی (الالە)، (الرب)، (العبادة)، (الدین) وەكو ئەوەی لە كاتی دابەزینی قورئاندا باو بو.

لەبەر ئەم دو هۆیە دەبینی زمانەوان و راڤەكارانی قورئانی پیرۆز لە چەرخەكانی دواییندا بە ناچاری زۆر لە وشەكانی قورئانیان بەو شێوەیە راڤە دەكرد كە ئاستی خوێندەواریی و رۆشنبیریی و تێگەیشتنی موسڵمانەكانی ئەو چەرخە دەخواست ، نەك بە پێی مانا زمانەوانیە رەسەنە قوڵەكەی خۆی، بۆ نمونە:

ـ وشەی (الە) یان بەرامبەر (بت) دانا، واتە بە ناوەڵناوی بت و بت پەرستییان دانابو.

ـ وشەی (رب)یان دانا بۆ ئەوكەسەی كە ئەركی پەروەردەكردن و پێگەیاندن دەگرێتە ئەستۆ..

ـ وشەی (عبادة)یان كورت هەڵهێنا لە مانای بەخوادانان و كڕنوش بردن و نوێژكردن بۆ خودای گەورەدا.

ـ وشەی (دین) یان بەرامبەر مەزهەب (Religion) دانا.

ـ هەروەها وشەی (تاغوت) بەمانای بت و شەیتانەكان لێكدرایەوە.

سەرەنجامی ئەمەش ئەوە بو کە خەڵکی بە زەحمەت لە مەبەستی سەرەکی و بنەڕەتی بانگەوازی قورئان تێ دەگەیشتنەوە. جا ئەگەر قورئان بانگی بکردنایە بۆ ئەوەی غەیری خودا نەپەرستن ؛ وایان دەزانی بە وازهێنان لە بت و سەنەمەکان هەقی ئەو بانگەیان داوە ، لەگەڵ ئەوەش هێشتا دەستیان بەرنەداوە لەو شتانەی کە ماناکانی (الالە) دەیانگرێتە خۆی بێجگە لە بت و سەنەم و هەستیش ناکەن بەو کردەوەیان غەیری (اللە)یان بەخودا داناوە.

کە قورئان بانگی دەکردنەوە بۆ ئەوەی غەیری (اللە) بە پەروەردگار نەگرن، وەکو ئێستا دەیانوت: ئێمە غەیری ئەو بە پەروەردەکارو سەرپەرشتیاری کاروبارمان نازانین، بەو شێوەیە بیروباوەڕمان لە روی یەکتاپەرستیەوە تەواوە، بەڵام لە راستیدا زۆربەیان گەردنکەچییان بۆ پەروەردگارێتی غەیری خوا دەکرد، بەگوێرەی ماناکانی وشەی (الرب) ئەوانە کەوتبونە جۆرە شیرکێکی ترەوە بێ ئەوەی هەستی پێ بکەن.

ئەگەر قورئان بەمانە بفەرموێت خودا بپەرستن و لە تاغوت دورکەونەوە، دەڵێن ئێمە لە شەیتان دورین و نەفرینی لێ دەکەین ، ئێمە بت ناپەرستین! و لە (اللە) نەبێ لە هیچی دی ناترسین، کەواتە ئەو فەرمانەی قورئانیشمان جێبەجێ کرد! کەچی دەیانبینیت هێشتا دەستیان بە کلکی تاغوتەکانی تر گرتوەو هەمو شێوەکانی پەرستنیان بۆ غەیری (اللە) بڕیار داوە تەنها (بەخودادانان) نەبێ.

بۆ ماناو واتاکانی (دین)یش هەروەتر.. خەڵکی لە مانای پوختەکردنی (ئایین) و یەکلابونەوە بۆ خودا تێناگەن، وا دەزانن تەنها ئەوەیە بڵێن فلانەکەس لەسەر ئایینی ئیسلامەو نەڵێن لەسەر ئایینی هیندی و جولەکەو دیانەکانە. لێرەوە وا حاڵی بون ئەوەی پێی بگوترێ موسڵمان ئەوا خۆی

یەكلاكردۆتـەوە بـۆ خـوداو دینەكـەی پوخـت و تـەواوە. كەچـی لـە راسـتیدا زۆربـەی ئەوانـە هێشتا - بـە گوێرەی ئـەو مانـا فراوانانـەی كـە وشـەی (دیـن) دەیانگرێتە خۆی - خۆیان بۆ خودا یەكلا نەكردۆتەوە .

## ئە نجامەكانی ئەم تێگەیشتنە چەوتە

ئـەو راسـتیەی كـە گومـانی تیـا نیـەو حاشـا هەڵنـەگرە ئەومیـە كـە خـەڵكی زۆربەی رێنماییەكانی قورئانیان لا شاراوەیە ، بـەڵكو ئـەو گیانـە بـەرزو فیكـرە سـەرەكیەیان لـێ بـزر بـوە كـە قورئـان بۆیـان و لێیـانی دەوێـت، خەڵكـە موسوڵمانەكە ئەم چوار زاراوە بنەڕەتیـەیان لا مەجهولـە، زۆر ناحـاڵیین لێیـان، ئەمەش لە دوای چەرخی زێڕینی سەلەفەوە تا ئێستا گەورەترین هۆكارێك بـوە كە سەری بۆ لاوازی و بێ هێزی بیروباوەڕیان و كردەوەیان كێشاوە، خـۆ ئەوانـە ئایینی ئیسلامیشیان وەرگرتبو و لەریزی موسڵمانانیش دەژمێردران.

لەبەر ئەمانە پێمان گرنگ بو مانای ئەو چـوار زاراوەیـە رون كەینـەوەو بـە درێژی باسی بكەین، تا مەبەسـتە راسـتەكەی قورئـان و فەرمایشـتە گرنگـەكانی دەركەوێ.

هەرچەندە من پێشتر لـە چـەند وتارێكمـدا كـە نوسـیومن هـەوڵم دا گرنگـی ئەم چەمكی ئەو زاراوانە گرنگتر نیشان بدەم، چونكە دەمزانی ئەوەی تا ئێستا لەم بابەتەدا نوسیومە بۆلابردن و رەواندنەوەی ئەو هەڵانەی خۆیان خزاندۆتە هـزری موسـوڵمانانەوە خـۆی لـە خۆیـدا بـەس نیـە، و بـایی ئـەوە ناكـەن كـە قەناعەت بە خەڵكی بێنن و دڵیان پێی ئاسودە بێت، لەبەر ئەوەی وا تێ دەگەن ئـەو توێژینـەوەو باسـكردنە تێروتەسـەلانەی بـۆ ئـەو وشـانەم كـردوە بـێ هێنانەوەی ئایەتی قورئانی پیرۆز یا پشت بەستن بە فەرهەنگەكانی زمان، ئەوا

تەنها رای خۆمەو هێناومە، ئاشکرایشە کە رای تایبەتی من ناتوانێ قەناعەت بەوانە بکات کە لەگەڵ راکانی مندا نین. بۆیە ویستم لەم نامیلکەیەدا مانا تەواو و گشتگیرییەکانی ئەم چوار زاراوەیە ئاشکرا بکەم بێ ئەوەی قسەیەك بهێنم کە قورئان پشتگیری نەکات، یا رایەك بهێنم کە پشتی بە فەرهەنگەکانی زمان نەبەستبێت. سەرەتا بە ویستی خودای باڵادەست دەست بە لێکۆڵینەوەی وشەی (الاله) دەکەم و ئینجا (الرب) ، دوایی (العبادة) و دواتر (الدین). ان شاء الله..

ئەبولئەعلا

# یەکەم: الالـــــە ( خودا )

## لێکۆڵینەوەی زمانەوانی

وشەی (اله) لە زمانی عەرەبیدا لە سێ پیتی (هەمزە، لام، ها) پێکهاتوە لە فەرهەنگەکانیشدا بەو مانایانەی خوارەوە هاتوە[١]:

١- أَلِهتُ الى فلان : واتە: دڵم لە کەناری ئەودا سوکنابو.

٢- ألِهَ الرجُل يألَهُ : پەنایدا لەوەی لێی دەترسا.

٣- ألِهَ الرجلُ الى الرجل : روی تێکردو بەرەو پیری چو چونکە شەیدایبو.

٤- ألهَ الفصيلُ بأمهِ : هۆگری دایکی بو و خۆی خستە باوەشییەوە.

٥- ألهَ إلهة وألوهة: پەرستی.

گوتراوە (الله) لە (لاهَ يليه ليهاً) وەرگیراوە، واتە بزر بو، دیار نەما.

بە تێڕوانین لەو مانایانەی سەرەوە بەدیار دەکەوێ کەوا ئەو هۆیەی (الە، یألە إلهة) بە مانای پەرستن واتە (تألە) وە (الله) بەمانای (المعبود) واتە پەرستراو بەکارهاتوە بریتیە لە :

١- پڕکردنەوەی نەبونی و بەدیهێنانی پێداویستی کەسێك کە هەست دەکات کەسێکی تر تواناو ویستی هەیەو بۆی دێنێتە دی، ئەمە دەبێتە پاڵنەری

---

[١] سەیری تەفسیری ابن کثیر بەرگی/١ لاپەڕە (١٩-٢٠) وە تەفسیری نیساپوری لەپەراوێزی تەفسیری طەبەری بەرگی/١ لاپەڕە (٦٥-٦٦) بکە.

یەکەمی پەرستن.. لەم پاڵنەرەوەیە دەبینیت ئەم کەسە مەیلی بۆ خاوەن توانو ویستەکە چوەو حەز بە نزیکبونەوەی دەکات، تا ئەوەندە هۆگریی دەبێت دەیپەرستێ، مرۆڤ بە خەیاڵیدا نایە کەس بپەرستێ ئەگەر نەزانێ پێداویستیەکانی جێبەجێ دەکات و لە تەنگانەدا بەسەری دەخاو بەهانایەوە دێ و ترس و دڵەڕاوکێی لەدڵدا لا دەبات.

٢- هەروەها ئەگەر بیروباوەڕی مرۆڤێك وابێت کە یەکێك هەیە پێداویستی جێبەجێ دەکاو بە هانای پاڕانەوەی خەڵکیەوە دێ، ئەوە ئەو قەناعەتەی بۆ دروست دەبێت کە ئەو لایەنە نەك هەر پلەو پایەی لەو بەرزترە، بەڵکو دەبێت دان بنرێت بە بەرزی و زاڵیی و هێزو دەسترۆیشتنیشیدا .

٣- ئەو کەسەی بەپێی یاساو رێسای سروشت و گەردون پێداویستیەکانی ئەم دنیایە جێبەجێ دەکات و زۆربەی کردەوەکانی لەبەرچاوان جێبەجێ دەبن و لە بازنەیەکدا کە لەزانستی ئێمە بەدەر نیە، ناچێتە ئەو مەقامەوە کە وەکو خوا تەماشا بکرێت و بپەرسترێت.

بۆ نمونە پیاوێك پێویستی بە هەندێك پارە دەبێت، دێتە لای پیاوێکی دی داوای ئیشێکی لێ دەکاو ئەویش بە دەنگیەوە دێت و کارێکی پێ دەسپێرێت و لەبری ئەو کارە کرێی دەداتێ، کابرا دەزانێ ئەم کرێیە لە بەرامبەر کارەکەی خۆیدایەتی کە ئەنجامیداوە.. هەرگیز بە خەیاڵیدا نایەت - چ جای ئەوەی باوەڕی وابێ - کە خاوەن ئیشەکە شایانی پەرستنە، چونکە دەزانێ و بە چاوی خۆیشی دیتی کە چۆن گەیشت بەو ئامانجەو ئەو رێگەیەی زانی کە پیاوەکە گرتیە بەر بۆ دابینکردنی پێویستیەکەی. بۆچونی پەرستن بە خەیاڵی کەسدا نایەت مەگەر پەرستراوەکەو دەسەڵاتەکەی لە پشتی پەردەی غەیب بن و توانای جێبەجێ کردنی پێداویستیەکان و کاریگەری لەسەر تەواوکردنی کاروبار لەژێر

پەردەی شاراوەیی بن. لێرەوە وشەیەك بۆ پەرستراو (معبـود) هەڵبـژێردراوە كـە مانای دیارنەبون و سەرسوڕمان و خۆشەویستی لەگەڵ مانـای بـەرز و بڵنـدیی و هێزو دەسەڵاتی ڕەها لەخۆ بگرێت .

٤- جا ئەوەی هیچ گومانی تێدا نیەو شتێكی سروشتیە ئەوەیە كە مـرۆڤ بـە شـەوق و زەوقـەوە بـەرەو ئـەو كەسـە دەچـێ كـە وا دەزانـێ لـە كـاتی ئاتاجیـدا پێداویستی بۆ جێبەجێ دەكات و لە تەنگانەدا بە هانایەوە دێت و لە دڵتەنگیدا هێوری دەكاتەوە.

جا لە هەمو ئەمانەوە بۆمان دەردەكەوێت كە ئـەو بیروبۆچونانەی كـە بـە هۆیانەوە وشەی (اله) بۆ پەرستراو بەكارهاتوە ئەمانەن:

جێبـەجێ كردنـی پێویسـتی و پـەنادان و هێوركردنـەوەو بـونی دەسـەڵات و بەرزیی و زاڵیی بەو شێوەیەی ڕەچاوی ئەوەی لـێ بكـرێ پێداویسـتی جێبـەجێ بكـات و لەتەنگانـەدا توانـای پـەنادانی هـەبێ و لەبـەر چـاوان دیـار نـەبێ، وەك ئەوەی نهێنیەك بێ كەس هەستی پێ نەكات، و خەڵك هۆگری بـن و لـەترس و تەنگانەدا پەنای بۆ ببەن.

## بیروبۆچونی نەفامان دەربارەی ( اله )

پـاش ئـەم لێكۆڵینـەوە زمانەوانیـە واچـاكە سـەیركەین بـزانین تێـڕوانین و بیروبۆچونی عەرەب و نەتەوەكانی پێشو بەرامبەر (الوهیه) چۆن بوە، كە قورئـان بە هاتنی پوچی كـردوە ، هـەر وەك لەمـەودوا بـە پێـی ئایەتـە پیرۆزەكـان رونـی دەكەینەوە.

خودای گەورە دەفەرموێت:

١- ﴿وَٱتَّخَذُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ ءَالِهَةً لِّيَكُونُواْ لَهُمْ عِزًّا ﴾ مـریم/٨١. واتـە: بێجگـە لە خودا چەند شتی تریان بە (الله) بە خودا دانابو تـا بۆیـان ببێتـە بەربەسـتی سزاو مایەی دەسەڵات.

﴿ وَٱتَّخَذُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ ءَالِهَةً لَّعَلَّهُمْ يُنصَرُونَ ﴾ یـس/٧٤. واتـە: بێجگـە لـە (الله) چەند خودای تریان هەڵبژاردو کردنیان بە خودای خۆیان، بەو ئومێدەی لە تەنگانەو شەڕو شۆڕدا سەریان بخەن.

لـەم دو ئایەتـە تـێ دەگـەین کـە ئەوانـەی نەفامـەکان دەیانکردنـە خـودای خۆیان، وایان دەزانی دۆست و پارێزەریانن لە ناخۆشی و تەنگانەدا ـ ئەگـەر لـە پەنای ئەواندا بن ـ ئەوا لەترس و کەموکوڕی بەدور دەبن.

٢- ﴿فَمَآ أَغْنَتْ عَنْهُمْ ءَالِهَتُهُمُ ٱلَّتِى يَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مِن شَىْءٍ لَّمَّا جَآءَ أَمْرُ رَبِّكَ وَمَا زَادُوهُمْ غَيْرَ تَتْبِيبٍ ﴾ هود/١٠١. واتـە: لـەو کاتـەی فـەرمانی پـەروەردگارت بـۆ فەوتاندنیان هات ـ خودای گەورە پێشتر باسـی نەتـەوەکان و پێغەمبـەرەکانیانی کرد کە ئـەوان هـەر بـەگوێیان نـەدەکردن، تـا خـودای گـەورە فەوتانـدنی ـ ئـەو خـودا داتاشـراوانە [١] کـە ئـەوان لـە جیـاتی خـوا هاواریـان دەکردنـێ و دەیانپەرستن، بە هاواریانەوە نەچون تاسزای خودای گەورەیان لەسەر لابەرن و هاوارکردنەکەیان خەسارەتمەندتری کردن.

---

(١) هەڵبەتـە ئێسـتاش لـەم خـوا داتاشـراوانە زۆرن کـە خـەڵکی هانایـان بـۆ دەبـەن و دەیانپەرستن و پشتیان پێ دەبەستن وەك: پیرو قەبرو شێخ و مشایەخ و پلەو پایەو حیزب و عەشیرەت و.....هتد. وەرگێڕ

﴿ وَٱلَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ لَا يَخْلُقُونَ شَيْـًٔا وَهُمْ يُخْلَقُونَ ﴿٢٠﴾ أَمْوَٰتٌ غَيْرُ أَحْيَآءٍ وَمَا يَشْعُرُونَ أَيَّانَ يُبْعَثُونَ ﴿٢١﴾ إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ ﴾النحل/٢٠-٢٢ واتـه : ئەوانەی بە خودایان داناون و لە جیاتی خودای گەورە هاوار بۆ ئەمان دەبەن، هیچ شتێكیان پێ بەدی نایەت چونكە خۆیان بەدی هێنراون، مردو و بێگیانن‌و زیندو نین ، خۆشیان نازانن كەی زیندو دەكرێنەوە، هەر خودای ئێوەیە كە تەنها خودایە.

﴿ وَلَا تَدْعُ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ﴾[1] القصص/٨٨ واتە : لەگەڵ (الله)دا هیچ خودایەكی دی بە ناهەق بڕیار مەدەو بانگی مەكە، چونكە هیچ پەرستراوێكی تر نیە شایانی پەرستنی راستەقینە بێت بێجگە لەو.

﴿ وَمَا يَتَّبِعُ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ شُرَكَآءَ إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ وَإِنْ هُمْ إِلَّا يَخْرُصُونَ ﴾ یونس/٦٦ واتـه : ئەو نەفامانەی بە شوێن ئەو هاوەڵانەدا دەچن كە بۆ خودایان بڕیارداوەو لە غەیری خوا دەیانپەرستن، درۆ دەكەن، تەنها دوای گومان و ئارەزوی خۆیان كەوتون.

لەم چەند ئایەتەی رابورد چەند شتێكمان بۆ رون دەبێتەوە، لەوانە :

یەكەم : هەبونی ئەو بتانەی كە نەفامەكان كردبویانن بە خودای خۆیان، لە تەنگانەدا هاواریان بۆ دەكردن و لێیان دەپاڕانەوە.

---

(1) تا ئێرە وشەی (اله) لە قورئاندا بەدو مانا بەكار هاتوە : یەكەمیان بەو پەرستراوەی كە خەڵكی لە واقیعدا دەیپەرستن جا پەرستراوێكی راست بێ یان نا ؟ مەبەست نیە . دوەمیش ئەو پەرستراوەی لەراستیدا دەبێ بپەرسترێ كە (اللە)یە . جا لەم ئایەتەدا وشەی (اله) بەهەردو ماناكە هاتوە.

دووەم : ئەوانەی كرابون بە خوا هەر بت نەبون، هەر جنۆكەو فریشتەش نەبون، بەڵكو مرۆڤیشیان تێدا بو! كە پێشتر مردبون و باوەڕیان بە كاریگەریی رۆحیانەتیان هەبو! وەك ئەم ئایەتە رونی دەكاتەوە كە دەفەرموێ: ﴿ أَمْوَٰتٌ غَيْرُ أَحْيَآءٍ وَمَا يَشْعُرُونَ أَيَّانَ يُبْعَثُونَ ﴾ واتە: مردون، زیندو نین.. خۆشیان نازانن كەینێ زیندو دەبنەوە؟!

سێیەم : وایان دەزانی كە ئەو بتانە گوێیان لێیانەو دەتوانن سەریان بخەن.

لێرەدا پێویستە خوێنەری بەڕێز ئەوە بزانێ كە چەمكی پاڕانەوە چۆنەو چۆن داوای سەرخستن و كۆمەكی لە (اله) دەكات.. كەیەكێك تینوی دەبێت داوای ئاو لە خزمەتكارەكەی دەكات بۆ بهێنێت، یا نەخۆش دەبێت داوا لە دكتۆر دەكات چارەسەری بكات، ناتوانین بڵێین ئەمە وەكو ئەو پاڕانەوە وایە كە لە خودای پەروەردگار دەپاڕێتەوە، یا مانای ئەوە نیە كە خزمەتكارەكە یا دكتۆرەكە بەخودا دانران.. لەبەر ئەوەی كارەكەیان بە پێی یاساو رێسای سروشتی هۆو هۆكار بو، لەو بازنەیە نەچوە دەرەوە. بەڵام كاتێ كابرا تینوی دەبێت یا نەخۆش دەكەوێت، داوا لەقەبری پیاوچاكێك بكات كە بە هەزاران كیلۆمەتر لێیەوە دورە، یا هاواری بتێك بكات و داوای لێبكات وەكو كە لە خودای پەروەردگاری داوادەكات، حەتمەن بەم داواكردن و پاڕانەوەو هانا بۆ بردنە ئەو قەبرە یان رۆحیانەتی ئەو پیاوچاكەی كردە خودا.

دەزانین كە كابرا داوا لەقەبرەكە یا بتەكە دەكاو هاواری لێدەكات، باوەڕی وایەو هەست دەكا كە لە دورەوە دەیبینن و گوێیان لە دەنگیەتی، لەبەر ئەوەی دەسەڵاتێكی واشیان بەسەر جیهانی هۆكارەكاندا هەیە ئیدی بەشێوەیەكی غەیبی و نادیارو بێ بەكارهێنانی هۆیەكان دەتوانن ئاوەكەی بدەنێ و شیفای نەخۆشیەكەشی بنێرن.

پوختـەی قسـان ئەوەیـە كـە مـرۆڤ لـە خـودا دەپاڕێتـەوەو هـاواری دەكـاتێ، بێشك بیروبۆچونی وایە كە خودا دەبینێت و دەبیستێت و دەسەڵاتی وای هەیـە كە بە شێوەیەكی غەیبی و دور لەیاسای سروشتی و هۆكار بۆی جێبەجێ بكات.

٣- ﴿ وَلَقَدْ أَهْلَكْنَا مَا حَوْلَكُم مِّنَ الْقُرَىٰ وَصَرَّفْنَا الْآيَاتِ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٢٧﴾ فَلَوْلَا نَصَرَهُمُ الَّذِينَ اتَّخَذُوا مِن دُونِ اللَّهِ قُرْبَانًا آلِهَةً ۖ بَلْ ضَلُّوا عَنْهُمْ ۚ وَذَٰلِكَ إِفْكُهُمْ وَمَا كَانُوا يَفْتَرُونَ ﴾ الاحقـاف/٢٧-٢٨ واتــە : ئـەو شـارو جێگایانــەی دەوری مەككـەمان وێـران كـرد. وەك نەتـەوەی (عـاد) كـە لـەناو گـردە زیخـەكان بـون و نەتـەوەی (سەمود) كە لە نێوان مەككەو شام بون، هەروەها (سەبەء) كە لە یەمەن بون و (مەدیـەن) كەلەسـەر رێگـای مەككـە بـۆ غـەزە بـون، هـەروەها ئـەو دەریاچـەی نەتـەوەی لوتیـدا پێـدا دەڕۆیشـت. ئایـەت و نیشـانەكانی خۆمـان بـە چـەندەها شـێوە بـۆ دوبارەكردنــەوەو نیشـانمان دانــەوە، كـە فەوتاشـن نـە خۆیـان و نـە ئەوانەی لە جیاتی (الله) بەخودایان دانابون لەبەین چون، ئـەدی ئەوانـەی كـە دەیانگوت ئەو پەرستراوانە لە خوامان نزیك دەكەنەوە، كوان؟! هیچیان پێكـراو توانیان سەریان خەن؟! یان هەر لێیان بزر بون و پێـك نەگەیشتنەوە؟ ئـەوەش ئەنجامی ئەو درۆیەی كـە دەیـانگوت ئەوانـەی بـە خوامـان دانـاون حەتمـەن بـە هانامانەوە دێن و بەسەرمان دەخەن. واش نەبو!

﴿ وَمَا لِيَ لَا أَعْبُدُ الَّذِي فَطَرَنِي وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٢٢﴾ أَأَتَّخِذُ مِن دُونِهِ آلِهَةً إِن يُرِدْنِ الرَّحْمَٰنُ بِضُرٍّ لَّا تُغْنِ عَنِّي شَفَاعَتُهُمْ شَيْئًا وَلَا يُنقِذُونِ ﴾ یـس/٢٢-٢٣ واتـە :بۆچی ئەو خودایە نەپەرستم كە منی هێناوەتـە بـون و هـەموش هـەر بـۆ لای ئــەو دەگەڕێنــەوە ؟ ئایــا دەشــێت جگــە لــەو چــەند خــودای تــر دانــێم و بیانپەرستم؟ كە ئەگەر خودای بەخشندە بیەوێت زیانێكم پـێ بگەیـەنێت ئـەو

خـوا قەسـتینانە نـاتوانن بـەتکا کـردنیش - ئەگـەر هـەیانبێت - ئـەو زیانـە بگێڕنــەوەو رزگــارم کــەن.. تکایــان نیــە، ئەگــەر هەشــیانبێت ســودێکم پــێ ناگەیەننن.

﴿وَٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِهِۦٓ أَوۡلِيَآءَ مَا نَعۡبُدُهُمۡ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَآ إِلَى ٱللَّهِ زُلۡفَىٰٓ إِنَّ ٱللَّهَ يَحۡكُمُ بَيۡنَهُمۡ فِي مَا هُمۡ فِيهِ يَخۡتَلِفُونَ﴾ الزمر/٣ واتە : ئـەو کەسانەی لـە جیاتی خــودای گــەورە شــت و کــەس و لایــەنی تــر دەکەنــە خــواو پــەروەردگارو سەرپەرشـتیاری خۆیـان دەڵێن : بـۆ ئـەوە دەیانپەرسـتین تـا لـەخودامان نزیـك بکەنەوە. (بۆ نمونە: ئـەو فریشـتانەی ئـەوان وایـان دەزانـی لای خـودا بـەرێزنو خـاوەن پلـەو ئاسـتن بـەردیان لـە شـێوەی وان بـە بۆچـونی خۆیـان دەتاشـی و دەیانپەرست) بێگومـان خـودا لـە رۆژی دواییـدا داوەری لـە نێـوان ئـەو شـتانەدا دەکا کە لەسەری جیاجیاییان هەیە و لەسەری ناکۆك بون.

﴿ وَيَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَضُرُّهُمۡ وَلَا يَنفَعُهُمۡ وَيَقُولُونَ هَٰٓؤُلَآءِ شُفَعَٰٓؤُنَا عِندَ ٱللَّهِ ﴾ یونس/١٨ واتە : شتی وا بێجگە لـە خـودا دەپەرسـتن کـە نـە زیانیــان پێدەگەیــەنێ و نــە قــازانج! دەشــڵێن ئەوانــە لای خــودا تکاکارمــانن و دەتوانن نزیکمان بکەنەوە لێی.

لەو ئایەتە پیرۆزانە چەند شتێك دەردەکەوێت، لەوانە :

- نەفامەکان بیروبۆچونیان وا نەبو کـە دەسـەڵاتی کـارگێڕیی ئـەم بونـەوەرە بەسەر بتەکاندا دابەشکرا بێت و خودایەکی بە دەسەڵات لەسەروی هەمویانەوە نەبێت، بەڵکو بیروبۆچونێکی رونیان لەوەدا هەبو، باوەڕیان وابو کە خودایـەکی زاڵ و بەدەسەڵات بەسەر هەمو خواکانی ترەوە هەیە کە بە وشەی (الله) ناویان دەهێنا. وایـان دەزانـی ئـەو داروبـەردو بتـە داتاشـراوانە بۆیـان هەیـەو دەتـوانن

هەندێك كاروباری ئـەو خـودا گـەورەو بـەدەسـەڵاتە بكـەن، چـونكە قسـەیان لای ئەو دەرواو ئاواتەكانی ئەمانیان پێ دێتە دی. بە هـۆی ئەوانـەوە دەتـوانن سـود وەرگرن و زیان لە خۆیان دور كەونەوە. لەبەر ئەمە بو كـە ئەوانیشیان لەگـەڵ (الله) دا بە خودا دادەنا.

جا لێرەوە دەردەكەوێت كە هەر كاتێك و هەر مرۆڤێك یـەكێك بكاتـە تكاكاری لای (الله) و لێی بپاڕێتەوەو پشتی پێببەستێ و بـە ڕێزلێنـان و بـە گـەورەدانانی و نەزرو قوربانی بۆ كردنی بە مەزنی بناسێت و بناسێنێت، ئـەوە بـە گـوێرەی ئـەو زاراوەی نەفامەكان دایان ناوە، بە خودا دانانی ئەو كەسەن. [1]

---

([1])دەبێ بزانین كە واستەو پاڕانەوە دو جۆرە : یـەكێكیان كـابرای واسـتەكار دەپاڕێتـەوە بـۆ یەكێكی دی و جۆرە دەسەڵاتێكی هەبێت لەسەر بەرامبەرەكەی (كە دەیەوێت ئیشەكەی لای ئەو جێبـەجێ بكـات) لەبـەر ئـەو دەسـەڵاتە گـەورە نـەتوانێ داوایەكـە رەت بكاتـەوە . وەك ئەوەی فەرمانبەرێكی گەورە داوا لە فەرمانبەرێكی بچوكتر لەخۆی بكات بۆ جێبەجێكردنی داواكاریـەك ئەگـەر واسـتەكەی لەگـەڵ نـەبێ ج جێبـەجێ نـاكرێ، لـەو كاتـە فەرمانبـەرە بچوكەكە ناتوانێ جێبەجێی نـەكات.. دوەمیـان ئەوەیـە كـە دەسـەڵاتی لەگەڵدا نیـە، بـەڵكو تەنها لەشێوەی داواكاریەكی ملكەچانە داوادەكرێت و بەرامبەرەكـەی بـەئارەزوی خۆیـەتی، قبوڵی بكا یان نا، وەكو ئەوەی كابرایەك عەریزەیەك دەداتە دائیرەیـەك بـەڵام ناتوانێت بـۆ جێبەجێ كردنی زۆریان لێبكات. جا ئەوەی وا بزانێت پاڕانەوەو واستەكردن لای خـوا واتـە شەفاعەت كردن وەك جۆری یەكەمە، ئەوا ئەو تكاكارە دەكا بەخواو دەبێتە هاوەڵپەیداكەر، قورئانیش ئەو جۆرە شەفاعەتە رەت دەكاتەوە.. بـەڵام بـە شـێوەی دوەم هـەمو پیاوچاك و پێغەمبەرو فریشتەو ئیماندارو هـەمو خـەڵكی دەگرێتـەوە كە داوا لـەخوا دەكـەن و خـواش بۆی هەیە قەبوڵی بكات یا رەتی كاتەوە، نەك كابرا پاڵ بداتەوە هیچ كردەوەی نەبێ و بڵێ پێغەمبەر ﷺ یان فلانە شێخ یان فلانـە كـەس شـەفاعەتم بـۆ دەكاو بەتـەمای ئـەو دەچـمە بەهەشتێ. پیاوچاكانیش لەرۆژی دواییدا هەتا خوای گەورەش ڕێیان پێ نەدات ناتوانن تكا بۆ كەس بكەن. (وەرگێڕ).

٤- ﴿وَقَالَ ٱللَّهُ لَا تَتَّخِذُوٓاْ إِلَٰهَيۡنِ ٱثۡنَيۡنِۖ إِنَّمَا هُوَ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞ فَإِيَّٰيَ فَٱرۡهَبُونِ﴾

النحل/٥١ واتە : خودای گەورە فەرموی : دو خودا مەپەرستن وا مەزانن کە دو خودا هەیە، بەڵکو تەنها یەك خودا هەیە ، جا کەوابو تەنها لەمن بترسن.

﴿وَلَآ أَخَافُ مَا تُشۡرِكُونَ بِهِۦٓ إِلَّآ أَن يَشَآءَ رَبِّي شَيۡـٔٗا﴾ الانعام/٨٠ واتە : ناترسم لەوانەی کردوتانن بە هاوبەشی خودا زیانم پێ بگەیەنن ، تەنها ئەگەر پەروەردگاری من کە (الله)یە بیەوێ توشی شتێکم بکا ئەوا توشم دێ.

﴿إِن نَّقُولُ إِلَّا ٱعۡتَرَىٰكَ بَعۡضُ ءَالِهَتِنَا بِسُوٓءٖ﴾ هود/٥٤ واتە: نەتەوەی (هود) بە هودیان گوت وا بزانین خودایەکانمان تۆیان توشی شێتی کردوەو دەستیان لێوەشاندوی ، چونکە تۆ جنێوت پێداون و ناهێڵی بیانپەرستین.

لەم چەند ئایەتە پیرۆزە بۆمان دەردەکەوێت کە نەفامەکان وایان دەزانی ئەگەر خودایەکانیان ( کە بۆ خۆیان دایانتاشیبون ) تورە بکەن گرنگیان پێنەدەن و سۆزیان بۆیان نەچێ ، ئەوا توشی ناخۆشی و نەبونی و نەهاتی و قات وقڕی و مردن دێن .

٥- ﴿ ٱتَّخَذُوٓاْ أَحۡبَارَهُمۡ وَرُهۡبَٰنَهُمۡ أَرۡبَابٗا مِّن دُونِ ٱللَّهِ وَٱلۡمَسِيحَ ٱبۡنَ مَرۡيَمَ وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُوٓاْ إِلَٰهٗا وَٰحِدٗاۖ لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۚ﴾ التوبة/٣١ واتە: قەشەو مالەکانیان (زانایانی دینەکەیان) کردبوە خودا، هەر وەکو کە عیسای کوڕی مەریەمیان کردبوە خودا، لە کاتێکدا کە تەنها فەرمانی ئەوەیان پێکرابوکە تەنها یەك خودا بپەرستن، چونکە بێجگە لەو خودای دی شایانی پەرستن بێ نیە.

﴿ أَرَءَيْتَ مَنِ ٱتَّخَذَ إِلَٰهَهُۥ هَوَىٰهُ أَفَأَنتَ تَكُونُ عَلَيْهِ وَكِيلًا ﴾ الفرقان/٤٣ واتـه : دەبینیت چۆن ئەو كەسەی هەواو ئارەزوی خۆی كردوه بە خـودای خـۆی؟!چما ئەوەی ئەو دەیكات بە ئۆباڵی تۆیە؟!

﴿ وَكَذَٰلِكَ زَيَّنَ لِكَثِيرٍ مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ قَتْلَ أَوْلَٰدِهِمْ شُرَكَآؤُهُمْ ﴾ الانعام/١٣٧ واته : هەروەها بت و زێوان و ئەوانەی ئەمان بە هاوەڵ و هاوبەشی خودای ان دانابون، كوشتنی منداڵەكانیان لە پێشچاوی خەڵكی جوان كردبو، ئیدی ئەمانیش بە گوێیان دەكردن! ئەوەش بەخودا دانانەكەی ئەوانە.

﴿ أَمْ لَهُمْ شُرَكَٰٓؤُاْ شَرَعُواْ لَهُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَنۢ بِهِ ٱللَّهُ ﴾ الشـــــوری/٢١ واتـه : یـان هاوەڵیـان بـۆ خـودا دانـاوە تـا یاسـاو رێسـای وایـان بـۆ دارێـژێت كـە خودای گەورە مۆڵەتی پێ نەداوە[١]..

بە سـەرنجدان لـەم ئایەتانـە دەردەكـەوێت كـە وشـەی (الـه) ئـەمجارە لێـرەدا مانایەكی تر دەبەخشێت كـە زۆر لـەوانی دی جیـاوازە. باسـی ئێـرە باسـی هـیچ دەسەڵاتێكی دەست رۆیشتو بەسـەر یاسـاكانی سروشـتدا نیـە ، ئـەوەی لێـرە بـە (اله) ناسێنـراوە دەرونی مرۆڤە یا هـەواو ئارەزوەكـەیـەتی، ئـەوەی لـەم ئایەتـەدا بە (خوا) ناسێنراوە، بۆ ئەوە نیە كە لە تەنگانـەدا هـاواری لـێ بكـەن یـا بـانگی

---

(١) ئەم ئایەتە راشكاوانە ئەوە دەگەیەنێت كە ئەو كەسەی یان كەسانەی پەیڕەو و پرۆگرام و دەسـتور بـۆ كۆمـەڵانی خـەڵك دادەنـێن كـە لـە دیـنی خـواوە سەرچـاوەی نـەگرتبێت، یـان خەڵكی هان دا لەسەر بەرنامەیەكی وا بڕۆن، ئەوا هەست بكا یان نەكات، بزانـێ یـا نـەزانێ، دان پێدا بنێ یا نكوڵی لـێ بكـات، خـۆی لـەریزی خـوا دانـاوەو داوای خوایـەتی لـەو خەڵكە كردوە، هەر كەسێك لەو خەڵكە بەو رۆڵ و لاف لێدانەی كابرا رازی بێت، یـان پێـی وا بێـت غەیری خوا مافی ئەوەی هەیە،كافرە.

كەن و لێی بپاڕێنەوە یا وابزانن كە زیانیان هەیە یان قازانج، بەڵكو بۆ ئەوەیە فەرمانەكانی بكەنە یاسای و ڕێسای دەستوری ژیانیان و ئەوەی ئەو بڵێت بیكەن ئەوا دەیكەن و ئەوەی ئەو بڵێ مەیكەن ئەوا لێی دور دەكەونەوەو نایكەن، چ شتێك ئەو حەڵاڵی كات ئەوا بە حەڵاڵی دەزانن و چ شتێك ئەو حەرامی بكات ئەوا بە حەرامی دادەنێن.. مانای (خوا) لێرەدا ئەوەیە كە ئەو كەس یان لایەنە پێویستی بەهێزێكی لە خۆی باڵاتر نیە بگەڕێتەوە لای و شتی لێ وەرگرێت و بیكاتە بەرنامەی ژیانی خەڵكی یان یاساو دەستوریان.. ئەو كەسە یان ئەو لایەنە (یان ئەو خودای ە كە لێرەدا بە یەكێك لە ماناكانی زاراوەی (اله)ە ) ئەوەیە كە مافی رەهای دارشتنی بەرنامەو یاساو ڕێسای هەیە..

جا ئایەتی یەكەم بۆمان دەردەخات كە چۆن جولەكەو دیانەكان قەشەو مالەكانیان كردبوە (اله) و پەروەردگاری خۆیان، هەر وەك لەو فەرمودەیەی كە (ترمذي) و (ابن جریر) گێڕایتیانەوە كە (عەدی كوڕی حاتەم) خودا لێی رازی بێت چوە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و لەوكاتەشدا خاچێكی لە ملدا بو كە لە زێر دروست كرابو، پێغەمبەرﷺ ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿ ٱتَّخَذُوٓاْ أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَـٰنَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ ﴾، عەدی دەفەرموێ پێم گوت: ئەی پێغەمبەری خوا خۆ ئەوانە قەشەو مالەكانیان نەدەپەرست، فەرموی: با دەیانپەرستن ! چونكە حەڵاڵیان بۆ حەرام دەكردن و حەرامیشیان بۆ حەڵاڵ دەكردن، ئەوانیش بەگوێیان دەكردن، ئەوەش پەرستنیانە.

بەڵام ئایەتی دوەم ماناكەی زۆر رون و ئاشكرایە كە ئەگەر یەكێك شوێنی هەواو ئارەزوی خۆی كەوێ ولە سەرەوەی هەمو شتێكی دابنێ لە راستیدا كردویەتیە (اله)

بەڵام ئەو دو ئایەتەی دوای ئەوان ئەگەرچی وشەی (شركاء) تیایاندا لە جێی (اله) بەكارهاتوە، بەڵام مەبەستی لە هاوەڵپەیداكردنە بۆ خودای گەورە لە (الوهیە) دا، جا لەو دو ئایەتەدا بەڵگەی ئاشكراو دیار هەیە كەوا ئەوەی وا بزانێت كە (پیاوێك یا كۆمەڵێك كەس بەرنامە، یان یاسایەك یا رێبازێك یا رێو رەسمێك دادەنێن و دەیكەنە یاسایەكی رەسمی) كە پێچەوانەی دینی خواش بێت، هەر یاسایەكی بە جێیە، ئەوا ئەو یاسادانەرانە لە تەوحیدی (الوهیە)دا بە هاوەڵی خودا دنراون.

## بنەمای بابەتی خودایەتی

هەمو ئەو شتانەی دەربارەی مانا جیاجیاكانی وشەی (الە) باسكران، پەیوەندیەكی ژیربێژی (مەنتیقی) یان لە نێواندا هەیە.. ئەو كەسەی شتێك بكاتە پشتیوان و سەرپەرشتیارو جێبەجێكەری پێداویستیەكانی ولابەری نەهامەتی لەسەری و وابزانێ كە وەڵامی پاڕانەوەی دەداتەوە توانای ئەوەی هەیە زیانی لێ بدات یا قازانجی پێ بگەیەنێت بە شێوەیەكی بەدەر لە یاساكانی سروشت، ئەوە ئەو شتەی بە خوا داناوە.. مادام وا دەزانێ كە ئەو شتە یان كەس و لایەنە جۆرە دەسەڵاتێكی سەربەخۆی بەسەر ئەم بونەوەرەدا هەیە. هەروەها ئەگەر كەسێك باوەڕی وا بێت كە ئەو شتە یان كەس و لایەنە دەتوانن لە رێی غەیبەوە زیان و سودی پێ دەگەیێنن.. چونكە وادەزانێ ئەو شتە، ئەو كەسە، ئەو لایەنە جۆرە دەسەڵاتێكی بەسەر ئەم بونەوەرەدا هەیە. هەروەها ئەو كەسەی باوەڕی بە خودای باڵادەست هێناوە بەڵام داوا لە غەیری خودا دەكات و پەنای بۆ دەبات! ئەمیش موشریكە مادام وادەزانێ ئەو شتانە، یان ئەو كەس و لایەنانە جۆرە هاوبەشیەكیان لەگەڵ خودا بۆ كارگێڕانی ئەم بونەوەرە هەیە!!

هەروەها هەر کەسێك یاساو دەستوری شتێك یان کەسێك یان لایەنێك جگە لە بەرنامەی خودا بکا بە یاسای ژیانی خۆی، فەرمان و قەدەغەکراوەکانی لەبەرچاو بگرێ بە جۆرێك پێی وال بێت دەبێت فەرمانی جێبەجێ بکاو لە قەدەغەکراوەکانیشی دور بکەوێتەوە، ئەمە بێگومان دان دەنێ بە دەسەلاتی ئەو شت و کەس و لایەنانەدا کە خاوەن یاساکەن و گوایە دەسەلاتێکی زاڵیان هەیە.

پوختەی قسان ئەوەیە بنەماو جەوهەری خودایەتی (الالوهیە) دەسەلاتە، بە مانایەکی تر: دەبێت خەڵکی باوەڕیان وا بێت کە ئەوی دەسەلاتی بەسەر ئەم بونەوەر و یاسا سروشتیانەدا زاڵە، هەر ئەوە کە دەبێت خەڵکی شوێنکەوتەی تەعلیماتی بن و بە پێویستی بزانن کە فەرمانەکانی جێبەجێ بکرێت و ملکەچی بۆ دەرببڕرێت.

## بەڵگەی قورئانی بۆ ئەم مانایە

ئەمە ئەو تێڕوانینەیە بۆ دەسەلات کە قورئانی پیرۆز دەیکا بە بناغەو چەندین بەڵگە بۆ سەلماندنی دەهێنێتەوەو پێچەوانەکەی کە (الوهیە)تی غەیری خودایە رەت دەکاتەوەو بڕیاری (الوهیە)ەکە تایبەت دەکاتەوە بە خودای بالادەست و بەس.

جا ئەوەی قورئان بە بەڵگەی دەیهێنێتەوە ئەوەیە کەوا کەس لە ئاسمانەکان و زەویدا جگە لە خودای گەورە دەسەلات وکارگێڕی بەدەست نیە. هێنانەبون و بەخشش و فەرمان دەرکردن و هێزو توانای گۆڕانکاریی بە دەست خۆیەتی وهەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدایە پێیان خۆش بێ یا پێیان ناخۆش بێ، ملکەچ و ژێرباری یاسای خودان، کەس جگە لە خۆی حوکم و دەسەلاتی بەسەر ئەم بونەوەرەدا نیە، تەنها بڕیارو تەعلیماتی ئەو دەبێ بەسەر ئەم

بونــەوەرە پــان و بەرینــەدا جێبــەجێ بکرێــت، کەســیش نهێنییــەکانی بــون و هێنانــەبون و بــەڕێوەبردن و یاســاکان نــازانێ، بۆیــە نابێــت هاوبەشــی خــودای گەورە بکات لە بەڕێوەبردنی فەرمانەکانیدا.

کەوایە لە راستیدا هیـچ خودایـەك نیـە تـەنها ئـەو نـەبێ. بۆیـە ئەوانـە هـەر کردەوەیـەك بکـەن مەبەسـتیان پـێ خودایـەکی دی بـێ، ئـەوا بـێ نـرخ و پـوچ و بێبایەخە. جا ئەو شتەی کە بە خودای دادەنێن لێی بپاڕێنەوە، یا خـۆی پـێ پـەنا دەدەن، یـا لێـی دەترسـن و دەیکەنـە واسـتەی نێـوان خۆیـان و خـودا، یـا بـەگوێی فەرمانەکانی دەکەن ئەوا ئەو پەیوەندیـەیان دەبـێ هەڵوەشـێننەوەو بەندایـەتییان تەنها بۆ (الله) بێ ، چونکە تەنها ئـەو کـە کردگـارە خـاوەنی دەسـەڵاتی بـەرزو بـە توانایە، نەك غەیری ئەو.

جا فەرمون لەگەڵ ئەو شێوازە پڕ ماناو بێ وێنەیەی کە قورئان بـە بەڵگـە دەیهێنێتەوە بۆ ئەو مانایانەی باسمان کردن :

ــ ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى فِى ٱلسَّمَآءِ إِلَٰهٌ وَفِى ٱلْأَرْضِ إِلَٰهٌ ۚ وَهُوَ ٱلْحَكِيمُ ٱلْعَلِيمُ﴾ الزخــرف/٨٤
واتە: خودا ﷻ ئەو خودایەیە لـە ئاسمانـدا پەرسـتراوەو لەزەویشـدا پەرسـتراوە، هەر ئەوە کاربەجێ و زانایە.

ــ ﴿ أَفَمَن يَخْلُقُ كَمَن لَّا يَخْلُقُ ۗ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴾، ﴿ وَٱلَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ لَا يَخْلُقُونَ شَيْـًٔا وَهُمْ يُخْلَقُونَ ﴾، ﴿ إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ ﴾ النحـل/١٧، ٢٠، ٢٢ واتــە: ئایـا ئەوەی کە شتان بەدی دەهێنێ وەکو ئەو کەسەیە کـە هـیچ بـەدی نـاهێنێ؟ ئایا بیر ناکەنەوە؟ ئەو بتانەی لەباتی خودا لێیان دەپاڕێنـەوە هیچیان پـێ دروسـت ناکرێ چونکە خۆیان دروست دەکرێن، واتە زەرەرو قازانجیان بەدەست نیە، جا خودای ئێوە تەنها یەك خودایە.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡۚ هَلۡ مِنۡ خَٰلِقٍ غَيۡرُ ٱللَّهِ يَرۡزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِۚ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ فَأَنَّىٰ تُؤۡفَكُونَ ﴾ فاطر/٣ واته : ئەی خەڵکینە نازو نیعمەتەکانی خوداتان وەبیر بێتەوە کە پێی بەخشیون، ئایا هیچ بەدیهێنەرێك هەیە لە ئاسمان و زەویدا رۆزیتان بدا؟ هیچ پەروەردگارێ نیە تەنها ئەو نەبێ، ئەگەر وایە ئیتر لە رێگەی حەق و یەکتاپەرستی چۆن و بۆچی لا ئەدرێن؟

﴿قُلۡ أَرَءَيۡتُمۡ إِنۡ أَخَذَ ٱللَّهُ سَمۡعَكُمۡ وَأَبۡصَٰرَكُمۡ وَخَتَمَ عَلَىٰ قُلُوبِكُم مَّنۡ إِلَٰهٌ غَيۡرُ ٱللَّهِ يَأۡتِيكُم بِهِ﴾ الأنعام/٤٦ واتە: بڵێ مەگەر لەوە نافکرن کە ئەگەر خودای گەورە چاو گوێی لێ سەندنەوەو مۆری لەسەر دڵیدان، کێ یە غەیری خودای گەورە پێتان بداتەوە؟

﴿ وَهُوَ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ لَهُ ٱلۡحَمۡدُ فِي ٱلۡأُولَىٰ وَٱلۡأٓخِرَةِۖ وَلَهُ ٱلۡحُكۡمُ وَإِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ ﴿٧٠﴾ قُلۡ أَرَءَيۡتُمۡ إِن جَعَلَ ٱللَّهُ عَلَيۡكُمُ ٱلَّيۡلَ سَرۡمَدًا إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ مَنۡ إِلَٰهٌ غَيۡرُ ٱللَّهِ يَأۡتِيكُم بِضِيَآءٍۚ أَفَلَا تَسۡمَعُونَ ﴿٧١﴾ قُلۡ أَرَءَيۡتُمۡ إِن جَعَلَ ٱللَّهُ عَلَيۡكُمُ ٱلنَّهَارَ سَرۡمَدًا إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ مَنۡ إِلَٰهٌ غَيۡرُ ٱللَّهِ يَأۡتِيكُم بِلَيۡلٍ تَسۡكُنُونَ فِيهِۚ أَفَلَا تُبۡصِرُونَ ﴾ القصص/٧٠-٧٢ واتە : (الله) ئەو زاتەیە کە هیچ خودایەك نیە تەنها ئەو نەبێت، لە دنیاو پاشەرۆژ شایانی سوپاس کردنەو حوکم گێران بۆ ئەوەو هەر بۆ لای ئەو دەگەڕێنەوە، ئەی موحەممەد پێیان بڵێ: هەواڵم پێ بدەن ئەگەر هاتو خودا شەوی لەسەر هەڵنەگرتن تا رۆژی دوایی، کێیە خودایەك بێجگە لەو روناکیتان بۆ بێنێ؟ ئایا نابیستن؟ پێیان بڵێ: ئادەی ئەگەر ویستی خودای گەورە وا بو کە رۆژتان بەردەوام کات و تا رۆژی دوایی شەوتان نەهێنێتەوە سەر، کێیە ئەو خودایەی جگە لە (الله) شەوتان بۆ دەهێنێتەوە تا تیایدا بحەسێنەوەو ئارام

بگرن؟ مەگەر نابینن؟! بۆچی بە چاوێکی ژیرانە سەیر ناکەن و بیری لێ ناکەنەوە ؟

﴿ قُلِ ٱدْعُوا۟ ٱلَّذِينَ زَعَمْتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ ۖ لَا يَمْلِكُونَ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِى ٱلْأَرْضِ وَمَا لَهُمْ فِيهِمَا مِن شِرْكٍ وَمَا لَهُۥ مِنْهُم مِّن ظَهِيرٍ ﴿٢٢﴾ وَلَا تَنفَعُ ٱلشَّفَٰعَةُ عِندَهُۥٓ إِلَّا لِمَنْ أَذِنَ لَهُۥ ﴾ سبأ/٢٢،٢٣ واتە : (ئەی پێغەمبەر بە کافرەکان) بڵێ: بانگ لەو بتانە بکەن کە گومانتان وایە خودان بزانن وەڵامتان دەدەنەوە؟ نەخێر.. ئەوانە نە لە ئاسمانەکان و نە لە زەویدا خاوەنی تۆزقاڵێك (مسقاڵە زەڕەیەك) شت نین، هەرگیز هیچ هاوبەشیەکیان لە زەوی و ئاسمانەکاندا نیە و یارمەتی خوداش بۆ هیچ شتێك نادەن و ناتوانن داوای لێخۆش بون بۆ هیچ کەسێ بکەن، مەگەر خودای گەورە خۆی رێیان پێ بدات.

﴿ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ ۖ يُكَوِّرُ ٱلَّيْلَ عَلَى ٱلنَّهَارِ وَيُكَوِّرُ ٱلنَّهَارَ عَلَى ٱلَّيْلِ ۖ وَسَخَّرَ ٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ ۖ كُلٌّ يَجْرِى لِأَجَلٍ مُّسَمًّى ۗ ﴾ الزمر/٥ واتە : خودای گەورەیە کە ئاسمانەکان و زەوی بەهەق دروست کردوە، شەو بەسەر رۆژدا دەپێچێتەوەو رۆژیش بەسەر شەودا دەپێچێتەوە، مانگ و رۆژی ژێربار کردوەو هەرکام لەوان بۆ کاتی دیاریکراو دەڕۆن، کاتیان دیاری کراوە تا چەند دەڕۆن و چۆن و کەی دەوەستن.

﴿ خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ ثُمَّ جَعَلَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَأَنزَلَ لَكُم مِّنَ ٱلْأَنْعَٰمِ ثَمَٰنِيَةَ أَزْوَٰجٍ ۚ يَخْلُقُكُمْ فِى بُطُونِ أُمَّهَٰتِكُمْ خَلْقًا مِّنۢ بَعْدِ خَلْقٍ فِى ظُلُمَٰتٍ ثَلَٰثٍ ۚ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمْ لَهُ ٱلْمُلْكُ ۖ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ فَأَنَّىٰ تُصْرَفُونَ ﴾ الزمر/٦ واتە: خودای گەورە ئێوەی لە یەك کەس دروست کردوە کە باوکە ئادەمە - سەلامی خودای لێ بێت - ئینجا

ژنەکەی کە دایکە حەوایە ـ سەلامی خودای لێ بێت ـ لەو دروست کردو هەشت جوت ماڵاتی (حوشترو مانگاو مەڕ) بۆ بەدیهێناون، لەزگی دایکتانا قۆناغ دوای قۆناغ لە نێوان سێ تاریکاییدا دروستتان دەکات (کە پەردەی زگ و پەردەی رەحم و پەردەی کۆرپەلەیە) ئەمەیە خوداوەند کە پەروەردگاری ئێوەیەو موڵك و دەسەڵات و پادشایی هەر بۆ ئەوە، هیچ خودایەك نیە تەنها ئەو نەبێت، ئیتر ئێوە چۆن لە رێگەی راست لا ئەدرێن و شتی تر دەپەرستن؟

﴿أَمَّنْ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَأَنزَلَ لَكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَنۢبَتْنَا بِهِۦ حَدَآئِقَ
ذَاتَ بَهْجَةٍ مَّا كَانَ لَكُمْ أَن تُنۢبِتُوا۟ شَجَرَهَآ ۗ أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ ۚ بَلْ هُمْ قَوْمٌ يَعْدِلُونَ
﴿٦٠﴾ أَمَّن جَعَلَ ٱلْأَرْضَ قَرَارًا وَجَعَلَ خِلَٰلَهَآ أَنْهَٰرًا وَجَعَلَ لَهَا رَوَٰسِىَ وَجَعَلَ بَيْنَ
ٱلْبَحْرَيْنِ حَاجِزًا ۗ أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ ۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٦١﴾ أَمَّن يُجِيبُ ٱلْمُضْطَرَّ إِذَا دَعَاهُ
وَيَكْشِفُ ٱلسُّوٓءَ وَيَجْعَلُكُمْ خُلَفَآءَ ٱلْأَرْضِ ۗ أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ ۚ قَلِيلًا مَّا تَذَكَّرُونَ
﴿٦٢﴾ أَمَّن يَهْدِيكُمْ فِى ظُلُمَٰتِ ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ وَمَن يُرْسِلُ ٱلرِّيَٰحَ بُشْرًۢا بَيْنَ يَدَىْ
رَحْمَتِهِۦٓ ۗ أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ ۚ تَعَٰلَى ٱللَّهُ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٦٣﴾ أَمَّن يَبْدَؤُا۟ ٱلْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ وَمَن
يَرْزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ ۗ أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ ۚ قُلْ هَاتُوا۟ بُرْهَٰنَكُمْ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ﴾

النمل/٦٠-٦٤ واتە : ئایا ئەوە کێیە ئاسمانەکان و زەوی بەدی هێناوەو ئاوی لە ئاسماندا بۆتان باراندوە؟ کە باخچەو بێستانی جوان و رازاوەمان پێ رواندوە، کە ئەتان دەتوانی دارو بارەکانی بروێنن بەبێ ئەو، ئایا لەگەڵ خوادا هیچ خودای تر هەیە؟ نا، ئەوانەی دەڵێن شتی تر هاوەڵێتی ئەوە خەڵکێکن لەرێ لادەرن. ئایا ئەوەی کە زەوی بەرقەرار کردوەو چەندین روباری بەناودا هێناوەو چیاکانی وەك مێخ بۆ داکوتاوەو لە نێوان دو دەریادا بەربەستی داناوە کێیە؟ ئایا لەگەڵ خوادا هیچ خودای تر هەیە؟ نا، بەڵام زۆربەیان نازانن. ئایا ئەوە کێیە کە بە

هانای ئەو کەسەوە دێت کە لە تەنگانەدایەو هاواری دەکاتیٚ؟! کە بە توانای خۆی ناخۆشی لەسەر لا دەباو دەتانکاتە بریکاری خۆی لەسەر زەوی؟ ئایا لەگەڵ خوادا هیچ خودای تر هەیە (ئەمە بکات)؟ کەم بیر دەکەنەوە! ئایا ئەوە کێیە کە لە تاریکییەکانی دەشت و دەریادا ڕێتان پیٚ نیشان دەدا؟! کێیە ئەوی بایەکان لە پێش ڕەحمەتی خۆیدا (کە بارانە) بە مزگێنیدەر دەنێرێت؟! ئایا هیچ خودایەك لەگەڵ خودای گەورەدا هەیە ؟ پاك و بەرزی بۆ ئەو خودایە، لەوەی کە هاوەڵ و هاوشان و هاوبەشی بۆ دادەنێن.. ئایا کێیە ئەوی کە دەست بە سەرەتای خەلق دەکاو پاشان دەمرێنیٚ و دواییش زیندوی دەکاتەوە؟! کیٚ لەئاسمان و زەویدا ڕزقتان دەداتیٚ؟! ئایا هیچ (اله) یێك لەگەڵ خودادا هەیە؟ بڵیٚ: ئەگەر ڕاست دەکەن هەیە دە بەڵگەی خۆتان بهێننەوە لەسەر ڕاستی قسەکەتان!!

- ﴿ٱلَّذِى لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَلَمْ يَتَّخِذْ وَلَـدًا وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ شَرِيكٌ فِى ٱلْمُلْكِ وَخَلَقَ كُلَّ شَىْءٍ فَقَدَّرَهُۥ تَقْدِيرًا ﴿٢﴾ وَٱتَّخَـذُوا۟ مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَـةً لَّا يَخْلُقُونَ شَيْـًٔا وَهُمْ يُخْلَقُونَ وَلَا يَمْلِكُونَ لِأَنفُسِهِمْ ضَرًّا وَلَا نَفْعًا وَلَا يَمْلِكُونَ مَوْتًا وَلَا حَيَوٰةً وَلَا نُشُورًا﴾

الفرقان/٢،٣ واتە : ئەوەی کە خاوەنی ئاسمانەکان و زەویەو منداڵی نیەو نە لە ئاسمانەکان و نە لە زەویدا هاوبەشێکی نە لە خاوەنێتیدا وە نە لە دەسەڵات و حوکمدا نیەو هەمو شتێکی بەدیهێناوەو بە پێی پێویست بۆ هەمو مەخلوقێك شتی بۆ دابین کردوەو ئەندازەگیری بۆ کردوە. کەچی موشریکەکان خودای تریان جگە لە (الله)گرتوەو دەیپەرستن کە هیچیان بەدی نەهێناوەو خۆیان بەدیهێنراون خودای وا کە هیچ قازانج و زیانێکیان نە بۆ خۆیان هەیە، نە بۆ غەیری خۆیان! نە مردن، نەژیان، وە نەزیندو بونەوەیان بەدەستە (وخاوەنی هیچ شتێك نین).

﴿ بَدِيعُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ أَنَّىٰ يَكُونُ لَهُۥ وَلَدٞ وَلَمۡ تَكُن لَّهُۥ صَٰحِبَةٞۖ وَخَلَقَ كُلَّ شَيۡءٖۖ وَهُوَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٞ ﴿١٠١﴾ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمۡۖ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ خَٰلِقُ كُلِّ شَيۡءٖ فَٱعۡبُدُوهُۚ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ وَكِيلٞ ﴾ الأنعـام/١٠٢،١٠١ واتـه : بەدیهێنـەری ئاسمانـەکان و زەویە، کە نە منداڵی هەیەو نە هاوسەری بۆ خۆی گرتوە، خـودا هـەمو شـتێکی بەدیهێناوە، بە هەمو شتێك زانایە، ئەمـە خوداتانـە کـە پـەروەردگاری ئێوەیـە، هیچ پەرسـتراوێکی راسـتەقینە نیـە تـەنها ئـەو نـەبێ، کردگـاری هـەمو شـتێکە، دەی کە وایە بیپەرستن و بزانن کە هەر ئەو سەرپەرشتیاری هەمو شتێکە.

﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَندَادٗا يُحِبُّونَهُمۡ كَحُبِّ ٱللَّهِۖ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَشَدُّ حُبّٗا لِّلَّهِۗ وَلَوۡ يَرَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓاْ إِذۡ يَرَوۡنَ ٱلۡعَذَابَ أَنَّ ٱلۡقُوَّةَ لِلَّهِ جَمِيعٗا ﴾ البقـــــرة/١٦٥ واتە : هەندێ خەڵك چەند بت و کەس و لایەنێك بە مـەزن و بـەڕێز دەگرێـت کـە دەیکاتـە هاوتـای مـەزنیی و ڕێـزی خـودای گـەورەو بەقـەدەر خـوا خۆشـیان دەوێن، بەڵام ئیمانداران زۆر لەوە زیاتر خودایان خۆش دەوێت، زەمانێـك دێـت (لە رۆژی دواییدا) کە ئەو زاڵمانە سزا و ئەشکەنجەکان دەبینن ـ کە قوتـاربونی لێ نیە ـ دەزانن کە هەمو دەسەڵاتێك هی خودای ەو لەدەستی خوادان و ناتوانن هەڵێن!

﴿ قُلۡ أَرَءَيۡتُم مَّا تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَرُونِي مَاذَا خَلَقُواْ مِنَ ٱلۡأَرۡضِ أَمۡ لَهُمۡ شِرۡكٞ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ ﴾، ﴿ وَمَنۡ أَضَلُّ مِمَّن يَدۡعُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَن لَّا يَسۡتَجِيبُ لَهُۥٓ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ وَهُمۡ عَن دُعَآئِهِمۡ غَٰفِلُونَ ﴾ الاحقـاف:٤، ٥ واتـە: (ئـەی پێغەمبـەر) بڵـێ: ئادەی پێم بڵێن بزانم ئەوانەی کە ئێوە لە غەیری خـودا، هانایـان بـۆ دەبـەن و لێیان دەپاڕێنەوە بزانم چییان خەلق کردوە؟! ئادەی نیشانم دەن، کوا چیان لـە

زەویـدا بـەدیهێناوە؟ یـان پشـکیان لـە خـاوەنێتی و بـەڕێوەبردنی ئاسمانەکانـدا هەیە ؟ .. کێ لەو کەسە گومڕاترە کە لە خودا یاخی دەبێت و و جگە لەو بانگ دەکا و هانا بۆ غەیری ئەو دەبات.. ئەوا هانا بۆ براوە بێ دەسەڵاتانە ئەگەر تا ڕۆژی قیامەت بانگ کرێن و هاناو هاواریان بۆ ببرێت، وەڵامیان نابێت، هەر لەم هاتوهاوارە بێ ئاگاشن[1]..

﴿ لَوْ كَانَ فِيهِمَآ ءَالِهَةٌ إِلَّا ٱللَّهُ لَفَسَدَتَا ۚ فَسُبْحَـٰنَ ٱللَّهِ رَبِّ ٱلْعَرْشِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿٢٢﴾ لَا يُسْـَٔلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْـَٔلُونَ ﴾ الانبیاء/٢٢،٢٣ واتە : ئەگەر زیاتر لە خودایەك بێجگە لە (الله) لە ئاسمانەکان و زەویدا هەبا، ئەوا یاسای ئەم بونەوەرە تێك دەچو، زەوی و ئاسمانەکان هەردوکیان - بەهۆی کێشەو ململانێ (التنازع) - تێك دەچون، کەوابو پاکی و بێگەردی بۆ ئەو خودایەی کە خاوەنی (عەرش)ەو دورە لەو شتە پڕوپوچانەی خودای پێ وەسف دەکەن و دەیدەنە پاڵی. پرسیار لە خودای گەورە ناکرێ دەربارەی ئەو شتانەی کە دەیکات، چونکە هەمو شتێکی بەجێیەو لە هەمو دەسەڵاتێك بەرزترەو ڕەت ناکرێتەوە، بەڵکو ئەوان پرسیاریان لی دەکرێ و لێییان دەپرسرێتەوە.

﴿ مَا ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ مِن وَلَدٍ وَمَا كَانَ مَعَهُۥ مِنْ إِلَـٰهٍ ۚ إِذًا لَّذَهَبَ كُلُّ إِلَـٰهٍۭ بِمَا خَلَقَ وَلَعَلَا بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ ﴾ المؤمنون/٩١ واتە: خودای گەورە هیچ زارۆکێکی بۆ خۆی هەڵنەگرتۆتەوەو هیچ خودایەکی تریشی لەگەڵدا نیە، ئەگەر خودای دیکەی لەگەڵبایە ئەوا هەر خودایەو بە ئارەزوی خۆی دەکرد.. هەر خودایەو مەخلوقەکانی خۆی دەبردو ئیدارەی دەدان! ئەوجا هەر یەکەشیان دەسەڵاتی

---

([1]) جا ئەوانەی لەمردو قەبرو شێخ و چاك و پیر دەپاڕێنەوە با چاك بزانن کە توانای وەڵام دانەوەیان تا ڕۆژی قیامەت نیە. -وەرگێڕ-

خۆی دەخستە کارو خۆی بەسەر ئەوانیتردا فەرز دەکرد .. ئەوەش یەعنی تێکچونی ئەو سیستم و دەستورە جوانەی ئێستا دەیبینین.

﴿لَّوْ كَانَ مَعَهُۥٓ ءَالِهَةٌ كَمَا يَقُولُونَ إِذًا لَّٱبْتَغَوْا۟ إِلَىٰ ذِى ٱلْعَرْشِ سَبِيلًا ﴿٤٢﴾ سُبْحَـٰنَهُۥ وَتَعَـٰلَىٰ عَمَّا يَقُولُونَ عُلُوًّا كَبِيرًا﴾ الاسراء/٤٢، ٤٣ واتە : ئەگەر خودای گەورە چەند خودایەکی بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری بونەوەر لەگەڵبایە وەکو ئەوان دەڵێن، ئەو کاتە گەلەکۆمەکەیان دەکرد تا بەسەر خودای خاوەن عەرشدا زاڵ بن و دەسەڵاتەکەی لەدەست دەربهێنن، ئەو خودایە پاك و بێگەرد و بەرزترە لەوەی ئەوان دەیڵێن.

لەو هەمو ئایەتانەی رابرد لەسەرتایەوە تا کۆتایی یەك بیرو هزری سەرەکی دەبینی، ئەویش ئەوەیە کە هەریەك لە خودایەتی و دەسەڵات (الالوهیة والسلطة) پێویستیان بەیەکتر هەیەو تەواوکەری یەکترین، لە روی ماناو گیانەوە هیچ جیاوازییەکیان نیە، جا ئەوەی دەسەڵاتی نەبێ ئەوا ناتوانێ ببێ بە (الە) و ناشگونجێ بکرێ بە (الە) ، بەڵام ئەوەی دەسەڵاتی هەبێ ئەوا دەگونجێ ببێ بە (اله) و هەردەبێ ئەو بکرێ. چونکە هەمو پێداویستیەکانی مرۆڤ کە بە (اله)وە بەندە یا ئەوەی کە مرۆڤ ناچار دەبێ یەکێك بکا بە (اله) بۆ جێبەجێ کردنی داخوازییەکانی بەبێ هەبونی دەسەڵات ناتوانێ هیچی جێبەجێ بکات. جا بۆیە هیچ مانای نیە یەکێ دەسەڵاتی نەبێ بکرێ بە (الە)، چونکە ئەوەش پێچەوانەی راستیە.. داوای شتێکی لێ بکەیت و نەتوانێت بۆت بهێنێتە دی! ئێ ئەوە وەکو ئەوەیە فو لە خۆڵەمێش بکەی کە هیچی لێ جێ نامێنێت.

ئـەو شـێوازەی كـە قورئـان بـە شـێوەیەكی زۆر رون و ئاشـكرا بەڵگـەی پـێ دێنێتـەوە، ئـەو بـیرە سـەرەكیەی لـە بەرچـاو گرتـوەو خوێنـەر دەتـوانێ بـە تێگەیشتنێكی تەواو لە پێشەكی و ئەنجامەكانی بگات بە پێی ئـەم ریزكردنـەی خوارەوە:

١- ئەو كردارانەی وەكو جێبەجێ كردنی پێداویستیەكان و لابردنـی زیـان و پـەنادان و سەرخسـتن و سـەركەوتن و چـاودێری و پاراسـتن و وەڵام دانــەوەی داخوازییەكان كە بەكەمتان داناوە، ئەوانە لە راستیدا گـەورەن و پەیوەندیـەكی پتەویان هەیە بەو هێزو دەسەڵاتەی كـە كـارگێڕی ئـەو بونـەوەرەی لـە دەسـتە. چـونكە ئەگـەر بێتـو بـیر بكەنـەوە لـەو رێگەیـەی كـە پێداویسـتیەكی بچـوك و بێبایەختان پێـی جێبـەجێ دەبـێ، ئـەوا ئـەو كاتـە دەزانـن كـە جێبـەجێ بـونی مەحاڵە بە بـێ ئـەوەی چـەند هۆكارێـك كـە لـە ژمـارە نایـەن لـە ئاسمانـەكان و زەویدا تێیدا بەشدار بن و بكەونە گەڕ، بۆ نمونە ئەو ئـاوەی كـە دەیخۆنـەوە یـا ئەو دەنكە گەنمەی كە دەیخۆن و سودی لێ وەردەگرن، نازانن پـێش ئـەوەی پـێ بگات و بگاتە دەستتان هـەر یەكـە لـە رۆژو بـاو زەوی و دەریاكـان بەشـداری لـە پێكهاتــەو گەشــەیدا دەكــەن. جــا ئــەوەی راســتی بــێ جێبــەجێ كردنــی پێداویستیەكانتان و وەڵامدانەوەی داخوازیـەكانتان دەسـەڵاتێكی كـەمی ناوێـت، بەڵكو پێویسـتی بـە دەسـەڵاتێك هەیـە كـە ئاسمانـەكان و زەوی بهێنێتـە بـون و ئەستێرەكان بجوڵێنێ و بـا هـەڵكاو بـاران ببارێنێـت، بـە كـورتی هەڵسوڕانـدن و كارگێڕانی ئەم بونەوەرەی هەمو دەوێ .[1]

---

(1) لەمەوە دەگەینە ئەوەی كە وەڵام دانەوەی داخوازی كـە لـە دەسـەڵاتی مرۆڤـدا نـەبێ بـە شێوەیەكی غەیبی بەوانەش ناكرێ كە زیندونە چ جای مردو.

٢ـ ناتوانین ئەو دەسەڵاتە لێك بترازێنین و پچڕپچڕو بەش بەش کەین وەکو بڵێین : بەدیهێنان لە دەست یەکێکەو ڕۆزی بە دەست یەکێکی ترەو ڕۆژ لە دەستی ئەم دایەو زەوی لە دەستی ئەوی ترە، دیسان ناکرێت دامەزراندن و پەیداکردن لە دەست یەکێ بێ و نەخۆشی و چاك بونەوەش لە دەست یەکێکی کە بێ و مردن و ژیانیش بەدەست یەکی تر بێت، چونکە ئەگەر وا بوایە ئەوا کاروباری ئەم بونەوەرە بەو ڕێکوپێکیە نەدەڕۆیی بەڕێوە، جا ئەوەی هەر دەبێ حەتمەن وابێ ئەوەیە کە هەمو دەسەڵاتەکان لە دەست یەك دادوەر بێت، کە هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدایە بگەڕێتەوە بۆ لای ئەو. چونکە یاساو سیستمی جیهان وا دەخوازێ کە کارەکە وابێ و لە واقیعیشدا هەر وایە .

٣ـ جا ئەگەر دەسەڵات هەموی لە دەست یەکێکەو بە قەد تۆزقاڵێك بەشی کەسی پێوە نیە، کەواتە خودایەتی (الوهیـة) هەر شایانی ئەوەو هەر لەویش دەوەشێتەوەو تایبەتە بەو، بێ هاوەڵ و هاوبەش.. جا کەوابو کەس ناتوانێ بەهاناتەوە بێ و پەنات بدات و بتپارێزێ یا سەرت بخات و پشتگیریت بکات، یا زەرەرو زیانت لێ بدات، تەنها ئەو خاوەن دەسەڵاتە نەبێ. جا کە وایە تەنها (الله) بە (الـه) واتە پەرستراو دەژمێردرێت و کەسی تر نیە ئەو سیفەتەی هەبێ یا بیدرێتێ بە پێی مانایەك لەو مانایانەی کە بەخەیاڵتاندا دێ. تەنانەت ناکرێ کەس (الە) تان بێ بەجۆرێك پایەیەکی هەبێ لای دادوەری ئەم بونەوەرەو تکای وەرگیرێ لای ئەو، لەبەر ئەوەی نزیکە لێی، نەخێر کەس ڕەتکردنەوەی فەرمانێکی پێ ناکرێت لە فەرمانەکانی خوا یا نکوڵیی کردنێك لە بەڕێوەبردنەکانی، یا دەست بخاتە کاروباری ئەوەوە.. کەس ناتوانێ دەست لە کاروباری وەربدا و وەرگرتنی تکاو ڕەتکردنەوەی لەسەر ویستی خۆی بەندەو کەس تواناى ناچارکردنی وەرگرتنی نیە.

٤. یەكپارچەیی ئەو دەسەڵاتە بەرزە وا پێویست دەكات كە جۆرەكانی حوكم و فەرمان هەموی بگەڕێتەوە لای یەك كەسی زاڵ و ناچاركار، ئەگەر نا بەشێك لەو دەسەڵاتە دەكەوێتە دەست یەكێكی دی، چونكە ئەگەر دروست كردن و بەدیهێنان تەنها لە دەستی ئەودا بێت و كەس تیایدا هاوبەشی نەكات و تەنها ئەو رۆزی بدات و دەستی كەسی تێدا نەبێ و تەنها ئەو كاروباری ئەم دنیایە بەڕێوە ببات لەوەشدا هیچ هاوبەشی نەبێ، ئەوا بە بڕیاری عەقڵ دەگەینە ئەوەی دەبێ حوكم و فەرمان و یاسادانان تەنها لەدەست ئەو بێ، لەو روەشەوە هیچ پاساو بیانویەك نیە بۆ ئەوەی هاوەڵێك بۆ ئەو خودایە هەبێ. هەروەكو نابێت یەكێك لەموڵكی ئەودا لە ئاسمانەكان و زەوی وەڵامی داخوازییەكانی خەڵك بداتەوەو پێداویستیەكانیان بۆ جێبەجێ بكات یا پەنادەری بێچارەیەك بێت، هەروەها نابێت و پێچەوانەی راستی و هەقە یەكێكی غەیری ئەو حاكمێكی سەربەخۆ بێ و فەرماندەرێكی دكتاتۆر بێت و یاسادانەرێكی دەست رۆیشتو و رەها بێت و بە یاسا نوقسانەكانی خۆی بكاتە شەریكی خودا.

بەراستی بەدیهێنان و رۆزیدان و ژیان و مردن و ژێربارکردنی رۆژو مانگو ئاڵوگۆڕ و پێچانەوەی شەو و رۆژ بەسەر یەكتردا و قەزاو قەدەرو حوكمو موڵك و فەرمان و یاسادانان، هەمویان چەند رویەكی جیاوازی یەك دەسەڵات پیشان دەدەن و روكاری یەك حوكم دەگرنەوەو حوكم و دەسەڵاتیش بە هیچ جۆرێ دابەش بون و پارچەپارچەكردن هەڵناگرێت.

ئەو كەسەی باوەڕی وابێ و پێی وا بێ فەرمانی یەكێك لە غەیری خودا لەو جۆرە فەرمانەیە كە دەبێ ملكەچی و گوێڕایەڵی بكرێت وەكو فەرمانی خودا ـ كە خودا رێی بەو فەرمانە نەدابێ ـ ئەوە هاوەڵ بۆ خودای گەورە بڕیار دەدا، وەكو ئەو كەسە وایە كە داوا لە غەیری خودا دەكا داخوازییەكانی بۆ جێبەجێ

بکات .[1] یا ئەوەی خۆی بە خاوەن موڵکی تەواو (مالك الملك) یا زاڵ و ناچارکەرو فەرمانڕەوای رەها (الحاكم المطلق) بـە مانـا سیاسیەکانی[2] وەك دکتاتۆرێـك کـە ئەوپەڕی دەسەڵاتی هەبێ بزانـێ ، ئەمـە وەکو بانگەشـەی خودای متـی وایـە کـە یـەکێك بـە خـەڵکی بڵێـت (مـن سەرپەرشـتیارو پـارێزەرو ئۆبـالگرو پشـتیوانی ئێوەم)، ئەمەش هەموی لە دەرەوەی چوارچێوەی یاسای سروشتی بێـت.[3] نـابینی کاتێ کە خودای گەورە باسی دەسەڵاتی خۆی دەکا لەبـەڕێوەبردنی سیستمی ئـەم بونەوەرەو بەدیهێنانی و ئەندازەگیری شتەکان، یەکسەر دوای ئەوە باسی حوکم‌و موڵك دەکا کە سەر بەخۆیەتی، واتە سەر بەخودایەو بەشی کەسی دی پێوە نیـە، ئەمەش بەڵگەیەکی رون وئاشکرایە کە خودایـەتی (الالوهيـة) حـوکم و مـوڵکیش دەگرێتەوە (واتـە فەرمانڕەوایـەتی و خاوەنـدارێتی). هـەروەها ئەمـەش پێویست دەکا کـە مـرۆڤ کـەس نەکاتـە هـاوەڵی خـودا لـەو شـتانەدا، چونکە یەکتاپەرسـتی خودایەتی (توحيد الالوهيـە) خوازیـاری ئەوەیـە کـە لـەم مانایەشـدا هـیچ شـتێك نەکرێت بە هاوەڵ و هاوبەشی خودا.

---

(1) وەکو ئەوانەی کە پێیان وایـە دەسـتورو یاسـای بەشـەری دەبێ وەکـو فەرمانـەکانی خـوا جێبـەجێ کرێن و نابێ سەرپێچی لی بکرێت، بەو شێوەیە لایان پـیرۆزە، بـەڵکو جـاری وایـە لەیاسای خوداش بەشیاوتری دەزانن.

(2) بـۆ زیـاتر ڕون کردنـەوەی ئـەو باسـە سـەیری نامیلکـەی ( نظريـة الإسـلام السياسـية)ی مامۆستا (ابو الاعلى المودودی) بکە.

(3) مەبەست لەیاسای سروشتی ئەوەیە ؛ مرۆڤ هەیە مرۆڤی تر دەپارێزێ لەسەرماو گـەرما بەهۆی ئاگرو ئامێری فێنککەرەوە، یا یارمەتی دەدا لە سەرخستنی شەڕێك بـە تـەکتیك، یـا شتێك کە لە دەسەڵاتی مرۆڤدا هەبێت یـا سەرپەرشـتی دەکـا تـا فێـری شـتێك دەبێـت، ئـەو جۆرە شـتانە دەبـن و رێپێـدراون، چونکە لەیاسـای سروشـتی تـێ ناپـەڕێ، بـەڵام کابرایـەك هەبێت داوا بکات کە هیچ دەسەڵاتێك نیە کار لەسروشتی بکـات و هـەر خۆیـەتی دەتوانێـت کار لەهـەمو شت بکـات ئەگـەر یاسـای سروشتیشی بـۆ بـەکار نـەهێنێ ، ئـەوا خـۆی دەکاتـە هاوەڵی خوا.

وە لەم ئایەتانەدا مەسەلەکە زیاتر رون کراوەتەوە:

﴿ قُلِ ٱللَّهُمَّ مَٰلِكَ ٱلْمُلْكِ تُؤْتِي ٱلْمُلْكَ مَن تَشَآءُ وَتَنزِعُ ٱلْمُلْكَ مِمَّن تَشَآءُ وَتُعِزُّ مَن تَشَآءُ وَتُذِلُّ مَن تَشَآءُ ﴾ آل عمران/٢٦ واتە : بڵێ خودایە ئەی خاوەنی موڵك و دەسەڵات، ئەوەی بتەوێ موڵك و دەسەڵاتی پێدەبەخشی و هەر کەسێکیش کە بتەوێت موڵك و دەسەڵاتی لێ دەسەنیتەوە، بە ئارەزوی خۆت هەندێك بەرز دەکەیەوەو هەندێکیش نزم دەکەیتەوە.

﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ ﴿١﴾ مَلِكِ ٱلنَّاسِ ﴿٢﴾ إِلَٰهِ ٱلنَّاسِ ﴾ الناس/١-٢ واتە : بڵێ خۆم پەنا دەدەم بە پەروەردگاری خەڵکی، خاوەن و پادشای خەڵکی، خودای خەڵکی.

هەروەها لە سورەتی (غافر) دا قورئان باشتر و راشکاوانەتر لە هەمو ئەوەی پێشو ئەم مەسەلەیە رون دەکاتەوە ، خودای گەورە دەفەرموێت

﴿ يَوْمَ هُم بَٰرِزُونَ لَا يَخْفَىٰ عَلَى ٱللَّهِ مِنْهُمْ شَيْءٌ لِّمَنِ ٱلْمُلْكُ ٱلْيَوْمَ لِلَّهِ ٱلْوَٰحِدِ ٱلْقَهَّارِ ﴾ غافر/١٦ واتە : لەو رۆژەی کە شتە نادیارەکان وەکو ئاگرو بەهەشت و حەشرو حیساب بە چاوی خۆیان دەبینن و هەمویان ئاشکراو نمایان دەبن و هیچ شتێك لەوان لە خوا ناشاردرێتەوە، بانگ دەکرێ: ئەمڕۆ موڵك وسەرۆکایەتی و گەورەیی بۆ کێیە؟ هەڵبەتە هیچ وەڵامێك نیە، تەنها ئەوە نەبێ کە: بۆ ئەو خودایەیە کە تاکە و هەمو بەدیهێنراوەکانی ژێربار و ناچار کردوە لەو رۆژەدا.(١)

---

(١) لەم سێ ئایەتانەدا باسی موڵك بە شێوەیەکی بەیەکەوە گرێدراو هاتوە، کەواتە باوەڕهێنان بەخوایەتی (الله) دەبێ باوەڕهێنان بێ بە دەسەڵاتی (الله) و ئەمەش دەبێ حوکمیش لەژێر ئەو دەسەڵاتەدا بێ و بەرنامەو دەستورو یاسا دەبێ لەژێر چاودێری ئەو

چ رۆژێکە کە پەردە لەپێش چاوی خەڵکی لادراوە، هیچ شتێك لە کاروباری ئەوان لە خودا شاراوە نیە، بانگکەرێك بانگ دەکا؛ ئەمڕۆ موڵك و دەسەڵات و پادشایی بۆ کێیە؟ .. هەڵبەتە هیچ وەڵامێك نیە تەنها ئەوە نەبێ کە موڵك و دەسەڵات هەمو هی ئەو خودایەیە کە دەسەڵاتەکەی بەسەر هەمو بونەوەردا زاڵە.

جوانترین شتێك کە ئەم ئایەتە لێك دەداتەوە ئەوەیە کە ئیمام ئەحمەد (ڕەحمەتی لێ بێ) لە عەبدوڵڵەی کوڕی عومەر (خودایان لێ ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەرﷺ ڕۆژێك لەسەر مینبەر ئەم ئایەتەی خوێندەوە :

﴿وَمَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦ وَٱلْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ مَطْوِيَّٰتُۢ بِيَمِينِهِۦ ۚ سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾، و بە دەستی پیرۆزی ئاماژەی بۆ دەکرد و بۆ پێش و پاشی دەجوڵاند و دەیفەرمو: خودای گەورە باسی گەورەیی خۆی دەکات، دەفەرموێت : (انا الجبار، أنا المتكبر، أنا العزيز، انا الكريم) واتە : من ناچارکەری بەدی هێنراوەکانم بۆ ئەو شتانەی خۆم دەمەوێ و پێیان دەکەم ، هەر من شانازی بە موڵك و دەسەڵاتم دەکەم، هەر من زاڵ و بەتوانا و دەست ڕۆیشتوم، هەر من سەخی و بەخشەرم، بێ ئەوەی سودێك یا شتێك لە بەرامبەرەکەم ڕەچاو بکەم. هەتا بەشێوەیەکی وا توند دەیفەرمو مینبەرەکەی لەگەڵیدا دەهەژایەوە تا گوتمان ئێستا مینبەرەکەی دەڕوخێنێ.

---

بێ و ئەو پێی ڕازی بێ و مافی کەسی دی نیە، چونکە کەس خاوەنی ئەم بونەوەرە نیە تەنها (الله) نەبێ. کەواتە چۆن خەڵکانێك دەتوانن لە موڵکی خوا کە موڵکی خۆیان نیە دەسەڵات بگێڕن و حوکم و یاسا دابنێن، ئایا دەبێ حاکمێك حوکم بەسەر شوێنێکدا بکات کە هی ئەو نەبێ ؟ - وەرگێڕ-

# دوەم: پــەروەردگـــار ( الرب )

## لێکۆڵینەوەی زمانەوانی

وشـەی (الـرَبُ) لـە پـیتی (ر) و (ب)ی دوبـارەکراوە(مشـدد) هـاتوە[١]، مانـای ئەســـڵی وبنـــەڕەتی (الـــرب) پەروەردکردنـــە، دوایـــی مانـــای هەڵســـوڕان و بـەڕێوەبردنی کاروبـارو شـت لـە ئەسـتۆگرتن و پـەیمان پێـدان و چـاکردن و تەواوکردنی لێ دەبێتەوە. لەوانەش مانای بەرزی و سەرۆکایەتی و موڵکداریی‌و گەورەیەتی لێ پەیدا دەبێ .

با زیاتر بەکارهێنانی وشەی (الرب) لە زمانی عەرەبی رون بکەینەوە[٢]:

### ١- پەروەردەکردن و پێگەیاندن و گەشە پێدان :

کـە دەڵـێن (ربَ الولـدَ) واتـە: منداڵەکـەی پـەروەردەی کـرد تـا پێگـەیی و هەسـتو هۆشی پەیدا کـرد، و (الرَبیـب) ئـەو کوڕەیـە کـە پـەروەردەی دەکـەیت.

---

(١) ئیبن فارس لە (مقاییس اللغـة) دا بـەرگی/٢ لا٢٨١-٢٨٢ دەڵێ : بابـەتی (ربُ) پـیتی (رب) چەند بنچینەیەکی ئەو وشەیە پێك دەهێنن، یەکەم: مانـای چاکردنی شت و سەرپەرشتی کردنیەتی بە بەردەوامی. کەواتە (رب) بـە مانـای خـاوەن یـا بەدیهێنـەر یـا چاککەری شت دێ.. دوەم: لەگەڵبون و سەرپەرشتی کـردن و ئاگاداری کـردن، کـە ئەمـەش لەگـەڵ یـەکتردا دەگونجێن.. سێیەم : پاڵدانی شتێك بۆ شتێکی تر، ئەمەش لەگەڵ ئەوەی پێشتر دەگونجێت، وەهەر کاتێ بە وردی بڕوانی دەبنیی ماناکان لەسەر یەك پێوەرن.

(٢) سـەیری (لسـان العـرب) مـادەی (ربـب) بـەرگی ١ لا٣٨٤-٣٩٤ وە (قـاموس المحیط) مـادەی (ربب) وە (المخصص) بەرگی ١٧ لا ١٥٤ بکە.

(الربيبة) مندالی کچ دەگرێتەوە کە پەروەردە کرابێ ، هەروەها هەردو وشەکە بەو مندالەش دەگوترێت کە لە مالی زڕباوکدا پەروەردە دەکرێت.

هەروەها (الربيبة) بەمانای (الحاضنة) واتە ئەو مندالەی بە دایەن دراوە، وشەی (الرابة) بە زڕدایك دەگوترێت، چونکە پەروەردەکردن و پێگەیاندنی مندالێك دەگرێتە ئەستۆ کە هی خۆی نیە. هەروەها (الرّاب) بەمانای باوەپیارە (مێردی دایك) دێ . (المربُب) یا (المربي) بەو دەرمانە دەگوترێت کە بۆ کاتی پێویست هەلدەگیرێ. وە هەروەها (ربَّ صربُ رَبَاً) واتە زیادکردن و هاویشتنە سەرو تەواوکردن کە لە بابی (نَصَرَ يتصُرُ) هاتوە ، وەك دەلێن (ربَّ النعمة) واتە چاکەی بە زیادەوە بەسەرا رشت و تیایدا وردبینی و دیقەتی بەکارهێنا.

٢- کۆکردنەوەو کۆمەلبون و ئامادەکردن :

کە دەلێن (فلن یرب الناس) واتە کابرا خەلکی کۆدەکاتەوە یا لە دەوری کۆ دەبنەوە و شوێنی کۆبونەوەیان ناو دەنێن (المـرَبّ) و (التربُـبَ) کە مانای کۆبونەوەو چونەپالْ یەك دەگرێتەوە .

٣- بەلێندان و چاککردن و چاودێری و لە ئەستۆگرتن و سەرپەرشتی کردن :

دەلێن (رَبَّ ضَيعة) واتە ئاگای لە باخەکە بو، چاوەدێری کرد.

(سەفوانی کوڕی ئومەییە) بە (ئەبوسوفیان)ی گوت: ئەگەر پیاوێك لە (قوڕەیش) لە ئەستۆم بگرێت و چاوەدێریم بکات پێم باشترە لەوەی پیاوێکی (هەوازن) لە خۆم بگرێت و چاوەدێریم بکات، واتە سەرپەرشتیم بکات و بمخاتە ژێر لوتف و چاودێری خۆیەوە.

وە (عەلقەمەی كوڕی عەبدە) دەڵێ :

وكنتَ إمرءاً أفضَتَ اليكِ رَبَابَتي وقبلَكِ رَبَّتني فضَيَعَت ربوب [١]

واتـە : ئێستا كاروبـارو بـەخێوكردنو ئاگـالێبونی مـن كەوتـە ملـی تـۆ، دوای ئـەوەی كـە چـەند كەسـێك پێشـی تـۆ ئاگـالێبون و سەرپەرشـتیكردنی منیـان خستبوە ئەستۆی خۆیان، كەچی بـاش ئاگاداریـان نـەدەكردم و كاروباریـان بـاش بەڕێوە نـەدەبردم.

هەروەها (فرزدق) دەڵێ :

كانوا كسالئةِ حمقاءَ اذا حقَنَت سلاءها في أديم غير مربوبِ [٢]

واتە : وەكو ئەو كەسە بێ عەقڵە وابون كە چەوری لەو پێستە دەدات كە نـەرم نابێتـەوەو ناغارێ .[٣]

وە دەڵێن : (فلن يربُ صنعته عنـد فـلان) واتـە : فڵان لای فڵانەكـەس ئـیش دەكاو لەسەر دەستی ئەو فێر دەبێ و شارەزایی پەیدا دەكا.

## ٤- پایەبەرزی و گەورەیی و سەرۆكایەتی و قسەڕۆیشتن و دەست لە كاروبــار وەردان و كاربەجێ بون:

دەڵێن (قد ربَ فلن قومـە) واتـە فڵان كـەس گەلەكـەی خـۆی بـەڕێوەبرد و كاروباری بۆ رێكخستن و وای لێكردن كە گوێڕایەڵی بكەن ، (رَبَيتَ القَومَ) واتـە بوم بە حاكم و گەورەو فەرمانڕەوایان .

---

(١) بەیتەكـە لـە دیـوانی عەلقەمەدایـە لا١٣٢ وە لـە (المفضـلیات)دا بـەرگی٢ لا ١٩٤ وە (لسـان العرب) مادەی (ربب) وە لە (مقاییس اللغـة) بـەرگی ٢ لا ٣٨٣ وە (تفسـیر الطـبري) بـەرگی ١ لا٤٨ وە (الصحاح) مادەی (ربب) وە (المخصص) بەرگی ١٧ لا ١٥٤.

(٢) السلاء: واتە (السمن) چەوری. بەیتەكە لە (لسان العرب)دا هەیە.

(٣) ناغارێ: واتە: (دباغة): خۆش نابێ .

لەبیدی کوڕی ربیعە دەڵێ:

وأهلكْنَ يوماً رَبَّ كِندَةَ و ابنه   وربَّ معدٍّ بين خَبْتٍ و عــرعرِ [(١)]

واتــە: ڕۆژێ ســەرۆکی کینــدەو کوڕەکــەی و گــەورەی (مەعــد) لــە نێـوان (خیبت)و (عەرعەر) لەبەین چون. لێرەدا (ربُّ كِندة) مانـای گەورەو سـەرۆکی (کیندە) دەگەیەنێ.

هەر لەم بارەیەوە (نابغة الذيباني) دەڵێ :

تخَبُّ الى النعمان حتي تناله    فدى لك من رب تليدي وطارفي [(٢)]

واتە : بەرەو مەلیکایەتی حیرە بەرز بویتەوە تا پێی گەیشتی، جا هەرچی ماڵی کۆن و نوێیە بە فیدات بێ.

**٥- خاوەنداریێتی :**

لە فەرمودەیەکدا هاتوە کەوا پێغەمبەر ﷺ لە پیاوێکی پرسی (أرَبُّ غَنَمٍ أم رَبُّ إبِلٍ) واتــە خــاوەنی مــەڕی یــا وشــتر؟ هــەر بــەو مانایــە بــە خــاوەن مــاڵ دەگوترێــت (رب الــدار) بــە خــاوەن وشــتریش (رب الناقــة)، خــاوەنی بــاخ و بێستانیش (رب الضيعة)، هەروەها وشـەی (الـرب) بـەمانای (سـيد) واتـە گەورە دێت بە پێچەوانەی بەندەو خزمەتکار.

* * *

(١) بەیتەکە لە تەفسیری (طبري) هەیە. بەرگی ١ لا ٤٧ وە تەفسیری (طبرسي) بـەرگی ١ لا ١١ وە (المخصص) بەرگی ١٧ لا ١٥٤.

(٢) تالد: ئـەو ماڵـە کۆنـەی لات هەیـە. بەیتەکـە لـە تەفسـیری (طـبري) ١٤١/١ هەیـە چاپی وەزارەتی مەعاریف لەتوێژینەوەی محمود شاکر. هـەروەها لـە (دیـوان) لا ٨٩ وە (المخصص) ١٥٤/٧.. طريف: ماڵی نوێ.

ئەمە چەند مانایەك بو كە لە وشەی (الـرب) دەبێتـەوە، جا سوێند بـە مانـەوەی خـودای پـەروەردگار[1] ئەوانـەی مانـای (الـرب)یـان لـە پـەروەردەكارو گەشـەپێدەردا تەسـك كردۆتـەوە بەهەڵەدا چون، كـاتێ لـە راڤـەو لێكدانـەوەی (الربوبيــة) دا ئــەم رســتەيە دوبــارە دەكەنـــەوە كــە (واتــا دامەزرانــدن و گەشەپێدانی شتێك جار لەدوای جار تـا دەگاتـە رادەی تـەواو بـون). بـەڵام لـە راسـتيدا ئەمــە تــەنها يــەك مانــا دەگرێتــەوە لــەو هــەمو مانــا فــراوان و جۆراوجۆرانەی ئەم وشەيە.

بە وردبونەوە لە فراوانی ئەم وشەيەو هێنانە بەرچاوی مانـا چڕوپڕەكانی دەگەينە ئەوەی كە وشەی (الرب) هەمو ئەم مانايانەی خوارەوە دەگرێتەوە:

١- پەروەردەكارو لە ئۆباڵ گرتن بۆ جێبەجێ كردنـی پێداويستيەكان و ئـەو كەسەی هەڵدەستێ بە پەروەردەكردن وپێگەياندن.

٢- لە ئۆباڵگرو چاودێر، بـەوەی بـە بـەڵێن پێـدان و چاكردنی حـاڵی ئۆبـاڵی بەئەستۆی خۆی بگرێ.

٣- سەرۆك و بەڕێز و گەورەيـەك لـە نـاو نەتەوەكەيـدا پايـەی هـەبێت و لـە دەوری كۆبنەوە.

٤- گەورەو سەرۆك و دەسەڵاتدارو دەست ڕۆيشتويەك كـە گوێڕايـەڵی بكـرێ، كە دان نـرابێ بە بەرزيی و گەورەيەتيدا، خۆشی خـاوەنی دەسـەڵاتێك بێـت كـە ويست و توانای ئيدارەی خەڵكی هەبێت (المالك لصلاحيات التصرف).

٥- خاوەن و گەورە و فەرمانڕەوا (الملك والسيد).

---

([1]) تەرجەمەی (لعمر الله)يە كە لە (لسان العرب)دا بابەتی (عَمَرَ) بەو جۆر هاتومو دەشـڵێن بەمانای (دين) هاتوە واتە سوێند بە (دينی خوا).

## بەکارهێنانی وشەی ( الرب ) لەقورئاندا

لـە قورئانــدا وشــەی (الــرب) بــە هــەمو ئــەو مانایانــەی باسمــان کــردن بەکارهاتوە، لە هەندێ جێ بە یەك ماناو لە هەندێکی تر بە زیاتر بەکارهاتوە، لە هەندێ شوێنیشا وشەکە بە هەمو ماناکان واتـە بـە هـەر پێنجیـان لـە یـەك کاتدا بەکارهاتوە. و ئێستا بە نمونەی ئایەتی قورئانی رونی دەکەینەوە:

### ١- بەکارهێنانی بەمانای یەکەم:

﴿قَالَ مَعَاذَ ٱللَّهِ إِنَّهُۥ رَبِّيٓ أَحۡسَنَ مَثۡوَايَ﴾[1]یوسف/٢٣ واتە: پـەنا بـە خـودا ئـەو پەروەردگاری منە کە بە چاکی پەروەردەی کردوم و شوێن و پلـەی مـنی جـوان کــردوە و گەشــەی پێــداوم لــەو مــاوە زۆرەی لێــرە مامــەوە . پێغەمبــەر یوســف

---

(١) کەس خەیاڵی بـۆ ئـەوەی نەچێ کـەوا پێغەمبـەر یوسف سـەلامی خـوای لـێ بـێ وشـەی (ربی) لە ئایەتەکەدا بۆعەزیزی میسری بەکارهێناوە. چونکە راناوی (هـاو) لـە (انـە)هکـەدا بـۆ (اللـه) دەگەڕێتـەوە کـە پێغەمبـەر یوسـف خـۆی پـێ پاراسـتوە لـە وشـەی (معـاذ الله) . ئاماژەی بۆ کراوە کە (الله) یـە نـزیکترە لـە رانـاوی ئیشـارەت بۆچـی ئامـاژەکراوێکی دورتـر بهێنین؟

ئێمـەش دەڵـێین: ئـەوەی مامۆسـتا مـەودودی دەڵـێ رانـاوی (هـاو) بـۆ عـەزیزی میسـر ناگەڕێتەوە لە تەفسیری (طبري) ١٢/١٠٨دا هاتوە لـە چـەند رێگەیەکـەوە لـە (مجاهـد)و (ابـن اسحاق)هوە گێڕاوێتیەوە کەسی تـر بـەم جۆرەی لێـك نەداوەتـەوە جگـە لـە (طـبري) .ئـەوەی مامۆستا مەودودی بۆی چوە لە تەفسیری ( طبرسي ) کـە نـاوی (مجمـع البیـان )ە (٢٢٣/٥)دا هاتوە کە دەڵێ : (گوتراوە کەوا (هاو) دەگەڕێتەوە بـۆ (اللـه)ی پـاك و بـێ وێنـە. ماناکەشـی ئەوەیـە کـە خـوای گـەورە بـەرزی کردومەتـەوەو چـاکەی لەگەڵـدا کردومـەو کردومـی بەپێغەمبەرو هەرگیز لێی یاخی نابم).

سەلامی خودای لێ بێ کاتێك ئەمەی فەرمو کە ژنی عەزیزی میسر خۆی رازاندەوەو دەرگاکانی داخست و گوتی خێراکە لەگەڵم وەرە سەر جێگا.

## ٢- بەکارهێنانی بەمانای دوەم و هەندێك لەمانای یەکەم :

ـ ﴿ فَإِنَّهُمْ عَدُوٌّ لِّيٓ إِلَّا رَبَّ ٱلْعَٰلَمِينَ (٧٧) ٱلَّذِي خَلَقَنِي فَهُوَ يَهْدِينِ (٧٨) وَٱلَّذِي هُوَ يُطْعِمُنِي وَيَسْقِينِ (٧٩) وَإِذَا مَرِضْتُ فَهُوَ يَشْفِينِ ﴾ الشعراء/٧٧-٨٠ واتە: ئەوان هەمویان دوژمنی منن، تەنها پەروەردگارو چاودێری جیهانیان نەبێ، ئەوە کە بەدی هێناوم و هەر ئەویش رێگەم نیشان دەداو هەر ئەویش خۆراك و خواردنەوەم پێ دەداو ئەگەر نەخۆش دەکەوم چاکم دەکاتەوە .

ـــ ﴿ وَمَا بِكُم مِّن نِّعْمَةٍ فَمِنَ ٱللَّهِ ثُمَّ إِذَا مَسَّكُمُ ٱلضُّرُّ فَإِلَيْهِ تَجْـَٔرُونَ (٥٣) ثُمَّ إِذَا كَشَفَ ٱلضُّرَّ عَنكُمْ إِذَا فَرِيقٌ مِّنكُم بِرَبِّهِمْ يُشْرِكُونَ ﴾ النحل/٥٣، ٥٤ واتە: هەر بەخشش و نیعمەتێکتان هەیە لە خوداوەیە، جا ئەگەر ناخۆشیەکتان توش بێت ئەوا هاواری وەبەر دەبەن و پەنا دەبەنە بەر ئەو خودای ە، پاشان هەر کە ئەو ناخۆشیەی لەسەر لادان ، ئەوا چینێکتان هاوەڵ بۆ خودای پەروەردگار بڕیار دەدەن و بە تەنها نایپەرستن.

ـ ﴿ قُلْ أَغَيْرَ ٱللَّهِ أَبْغِي رَبًّا وَهُوَ رَبُّ كُلِّ شَيْءٍ ﴾ الانعام/١٦٤ واتە : بڵێ: ئایا بێجگە لە خودای تاقانە پەروەردگارێکی تر بخوازم؟ لە کاتێکدا ئەو پەروەردگاری هەمو شتێکە؟

ـ ﴿ رَّبُّ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ فَٱتَّخِذْهُ وَكِيلًا ﴾ المزمل/٩ واتە : پەروەردگاری رۆژهەڵات و رۆژئاوایە، هیچ پەرستراوێکی بەڕاستی نیە تەنیا ئەو نەبێ، کەوابو ئەو بکە بە پشتیوان و کار هەڵسوڕێنەری خۆت.

### ٣- بەکارهێنانی بەمانای سێیەم:

- ﴿هُوَ رَبُّكُمْ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾ هود/٣٤ واتـە : خـوا گـەورەو پـەروەردگاری ئێوەیەو هەر بۆ لای ئەویش دەگەڕێنەوە.

- ﴿ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُم مَّرْجِعُكُمْ﴾ الزمـر/٧ واتـە : ئینجـا گەڕانـەوەتان بـۆ لای گەورەو پەروەردگارتانە.

- ﴿قُلْ يَجْمَعُ بَيْنَنَا رَبُّنَا﴾ سـبأ/٢٦ واتـە : بڵـێ: پـەروەردگارمان (گشـتمان لـە ڕۆژی دواییدا) کۆ دەکاتەوە.

﴿وَمَا مِن دَابَّةٍ فِي الْأَرْضِ وَلَا طَائِرٍ يَطِيرُ بِجَنَاحَيْهِ إِلَّا أُمَمٌ أَمْثَالُكُم مَّا فَرَّطْنَا فِي الْكِتَابِ مِن شَيْءٍ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّهِمْ يُحْشَرُونَ﴾ الانعـام/٣٨ واتـە: هـیچ شـتێك نیـە لەسـەر زەوی بجوڵێتـەوەو هـیچ باڵندەیـەك نیـە کـە بـە دو بـاڵی خـۆی بفڕێـت، وەکـو ئێـوە کۆمەڵ و نەتەوە نەبن.. هیچ شتێکمان لەم کتێبەدا فەرامۆش نـەکردوە، دوایـی خۆیان زیندو دەکرێنەوەو لای خودای کۆدەکرێنەوە لێیان دەپرسرێتەوە.

﴿وَنُفِخَ فِي الصُّورِ فَإِذَا هُم مِّنَ الْأَجْدَاثِ إِلَىٰ رَبِّهِمْ يَنسِلُونَ﴾ یـــس/٥١ واتـــە : کاتێکیش کە فو بە کەڕەنادا دەکرێ، ئیدی ئەو کاتە هەمو لە گۆڕەکانیـان دێنـە دەرەوەو بەرەو لای پەروەردگار بەخێرایی دەڕۆن.

### ٤- بەکارهێنانی بەمانای چوارەم و هەندێکیش لە مانای سێیەم :

ـــ ﴿اتَّخَذُوا أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ اللَّهِ﴾ التوبـــة/٣١ واتـە : لـەباتی خـودای گـەورە قەشـەو مالـەکانیان کردبـوە گـەورەو خودایـانی خۆیان وگوێڕایەڵیان دەکردن لە حەڵاڵ کردن وحەرام کردندا.

ـــ ﴿وَلَا يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضًا أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ﴾ آل عمـــران/٦٤ واتـــە: بـــا هەندێکمان خۆمان نەکەینە گەورەو پەروەردگاری هەندێکمان بە جۆرێك لە هەمو شتێکدا گوێڕایەڵی بکەین لەو کارانەشدا کە خودای گەورە رێی پێ نەداوە ( وەکو جولەکە کە سەیدنا عوزێریان سەلامی خودای لێ بێ دەپەرستو دیانەکان سەیدنا عیسایان سەلامی خودای لێ بێ دەپەرست گوێڕایەڵی قەشەو مالەکانیان لە حەڵاڵ کردن و حەرام کردنیاندا دەکرد.

مەبەست لە وشەی (أرباب) لەم دو ئایەتەدا ئەوەیە کە ئەو کەسانەی نەتـــەوەو میللـــەت و تایفـــەکان دەیانکـــەن بـــە ڕدێـــن ســـپی و ڕێنیشـــاندەرو بەرنامەدانەری خۆیان، فەرمانەکانیان بە شێوەیەکی گشتی ورەها جێبەجێ دەکەن وئەوەی قەدەغەشی بکەن وازی لێ دەێنن و لەسەر یاساکانیان دەڕۆن و باوەڕیان بەحەڵاڵ و حەرامەکانیان هەیە (ئەگەر چی خودای گەورەش رێی پێ نەدابێ) زیاد لەمەش دەڵێن ئەم گەورانە شایانی ئەوەن کە لە خۆیانەوە فەرمان دەرکەن و یاسا دانێن و شتیش قەدەغە و یاساغ بکەن ! ئەمانەش هەموی سیفەت و کاری خودای هەتین!!

ـ ﴿أَمَّآ أَحَدُكُمَا فَيَسۡقِي رَبَّهُۥ خَمۡرًا﴾.. ﴿وَقَالَ لِلَّذِي ظَنَّ أَنَّهُۥ نَاجٍ مِّنۡهُمَا ٱذۡكُرۡنِي عِندَ رَبِّكَ فَأَنسَىٰهُ ٱلشَّيۡطَٰنُ ذِكۡرَ رَبِّهِۦ﴾.. ﴿فَلَمَّا جَآءَهُ ٱلرَّسُولُ قَالَ ٱرۡجِعۡ إِلَىٰ رَبِّكَ فَسۡـَٔلۡهُ مَا بَالُ ٱلنِّسۡوَةِ ٱلَّٰتِي قَطَّعۡنَ أَيۡدِيَهُنَّۚ إِنَّ رَبِّي بِكَيۡدِهِنَّ عَلِيمٞ﴾ یوســـف/٤١، ٤٢، ٥٠ واتـــە : ئـــەی دو هاوەڵەکـــەی زینـــدانم ، یـــەکێك لـــە ئێـــوە شـــەراب دەداتـــە گەورەکەی خۆی .. وە پێغەمبەر یوسف سەلامی خودای لێ بێ بەو کەسەیانی فەرمو لەو دوانە کە زانی لە بەندیخانە قورتاری دەبێ؛ دەبێ لای گەورەکەت (پاشای میسر) باسم بکەیت تاب یریان بخەیتەوە کە لە بەندیخانە ماومەتەوە،

بەڵام شەیتان لە بیر کابرای بردەوە کە لای (رب) و گەورەکەی خۆی باسی سەیدنا یوسف بکات سەلامی خودای لێ بێت.. کاتێ کە نێرراوی سەرۆکی میسر چوە لای سەیدنا یوسف، سەیدنا یوسف فەرموی: بگەڕێوە لای سەرۆکەکەت پرسیاری لێ بکە بزانە ئەو ئافرەتانەی دەستی خۆیان بڕی، بۆچی وایان کردو دەربارەی من چ دەڵێن؟ بێگومان پەروەردگارم بە فڕوفێڵیان ئاگادارە.

لەم ئایەتانەدا پێغەمبەر یوسف سەلامی خودای لێ بێ کاتێ قسە لەگەڵ خەڵکی میسر دەکا ناوی عەزیزی میسری بە وشەی (ربهم) دوبارە کردۆتەوە، ئەمەش لەبەر ئەوەی کە خەڵکی میسر دانیان نابو بە دەسەڵات و پلەوپایەی عەزیزو باوەڕیشیان وابو کە خاوەنی فەرمانکردن و پێشگیری کردنە (مالك الامر والنهي)، چونکە لە واقیعدا ئەو پاشا فەرمانڕەوایە، پەروەردگاری خەڵکی میسر بو، بەڵام سەیدنا یوسف خۆی بە پێچەوانە وشەی (الرب)ی تەنها بۆ (اللە)ی بەکارهێناوە، چونکە پێغەمبەر یوسف سەلامی خودای لێ بێ قەناعەتی وا نەبو کە فیرعەون زاڵ و خاوەن هێزیرەهای ناچاری کردن و خاوەنی فەرمان و پێشگیری کردنە، بەڵکو باوەڕی وابو کە تەنها خودای گەورە ئەو شتانەی لە دەستە و خاوەنی ئەم سیفەتانەیە.

### ٥- بەکارهێنانی بەمانای پێنجەم:

- ﴿فَلْيَعْبُدُوا رَبَّ هَذَا الْبَيْتِ ﴿٣﴾ الَّذِي أَطْعَمَهُم مِّن جُوعٍ وَآمَنَهُم مِّنْ خَوْفٍ﴾ قريش/٣،٤ واتە : با خاوەنی ئەو (کەعبەیە) بپەرستن کە لەوپەڕی برسیەتیدا تێری کردن و لەوپەڕی ترس و بیمدا ئەمانی پێ بەخشین...

- ﴿سُبْحَانَ رَبِّكَ رَبِّ الْعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ﴾ الصافات/١٨٠ واتە: پاکی وبێگەردی بۆ پەروەردگاری تۆ کە پەروەردگاری خاوەن دەسەڵات و بە عیززەتە، پاك و بێ

خەوشی بێ ئەو لەو نوقسانیانەی كە دەیدەنە پاڵیی وەسفی ئەوی پێدەكەن.

- ﴿فَسُبْحَٰنَ ٱللَّهِ رَبِّ ٱلْعَرْشِ عَمَّا يَصِفُونَ﴾ الانبياء/٢٢ پاكی بۆ خودای خاوەن عەرش لەو شتە پڕوپوچانەی وەپاڵی دەدەن، لە هاوەڵ و خێزان و منداڵ.

ـ ﴿قُلْ مَن رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ ٱلسَّبْعِ وَرَبُّ ٱلْعَرْشِ ٱلْعَظِيمِ﴾ المؤمنـون/٨٦ واتـە : بڵێ كێ خاوەن و بەدیهێنەری حەوت ئاسمانەكانەو خاوەن و بەدیهێنـەری ئـەو عەرشە گەورەیە؟

- ﴿رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا وَرَبُّ ٱلْمَشَٰرِقِ﴾ الصافات/٥ واتـە: خـاوەن و بەدیهێنـــەری ئاسمانـــەكان و زەوی و ئـــەوەی لـــە نێوانیاندایـــەو خـــاوەن و بەدیهێنەری ڕۆژهەڵاتەكانە.

- ﴿وَأَنَّهُۥ هُوَ رَبُّ ٱلشِّعْرَىٰ﴾ النجم/٤٩ واتە : بەراستی خودای مـەزن خـاوەن و پەروەردگاری ئەو ئەستێرەیە كە ناوی (شیعرا: گەلاوێژ) ە، ئـەو ئەستێرەیەی كـە نەفامـەكان دەیانپەرسـت و بـە خودایـان دەزانـی. واتـە خـودا خـاوەنی پەرستراوەكەی ئەوانیشە.

## تێڕوانینی نەتەوە گومڕاكان سەبارەت بە پەروەردگارێتی

لەو ئایەتانەی رابرد وشـەی (رب) ماناكـەی وەكو رۆژ لـە ئاسمـانی هاویـنـدا رۆشن و دیارە كە هیچ پەڵەهەوری لەسەر نییە.. بـەڵام ئینجا بـا ئـەوە بـزانین تێـڕوانینی نەتــەوە سـەر لیشـێواوەكان چـۆن بـوەو چـۆن و لەبەرچـی قورئـان بەرپەرچـی داوەتــەوەو هـەڵی وەشـاندۆتەوە.. ئـەدی ئـەو مەبەسـتە چـییە كـە قورئان بانگهێشتی بۆ دەكات؟

جا باشتر وایە هەر نەتەوەیەك بە جیا باس بكـەین لـەبارەی بیروبۆچـون و باوەڕیانەوە تا بە ئاشكرا و بێ تەمومژ بۆمان رون بێتەوە و تێبگەین .

### نەتەوەی سەیدنا نوح سەلامی خودای لێ بێت:

كـۆنترین نەتــەوە لـە مێـژودا كـە قورئـان باسـی كردبـێ نەتـەوەی (نـوح)ە سـەلامی خـودای لـێ بـێ ، جـا لـە قورئانـا بـە دیاردەكـەوێ كـە ئەوانـە نكوڵیـان نەدەكرد لە هەبونی خـودای گـەورەدا، وەك لـە باسـی رەتكردنـەوەی بانگـەوازی نوحدا بەدیار دەكەوێ كە گوتیان:

- ﴿مَا هَٰذَآ إِلَّا بَشَرٌ مِّثۡلُكُمۡ يُرِيدُ أَن يَتَفَضَّلَ عَلَيۡكُمۡ وَلَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ لَأَنزَلَ مَلَٰٓئِكَةً﴾

المؤمنون/٢٤ واتە : گوتیان: نوح تەنها مرۆڤێكە وەكو ئێوەو هیچیتر، دەیەوێ بە داواكردنی پێغەمبەمبەرایەتی خۆی لە ئێوە گەورەتر بگرێ. ئەگەر خودا بیویستبایە پێغەمبەرێك بنێرێ ئەوا فریشتەیەكی دەنارد.

هـەروەها نكوڵییـان لـەوە نـەدەكرد كـە خـودای گـەورە بەدیهێنــەری ئـەم بونەوەرەیەو بە مانای یەكەم و دوەم پەروەردگارە، چونكە كاتێ نـوح سـەلامی

خودای لێ بێ پێی گوتن: ﴿هُوَ رَبُّكُمْ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾ هود/٣٢ واتە (اللە) پەروەردگار و (رب)ی ئێوەیەو بەدیهێنەرو کارهەڵسورێنەری ئێوەیەو توانای دەست لەکاروبار وەردانیشی هەیەو بۆ لای ئەویش دەگەڕێنەوە. یان (اسْتَغْفِرُوا رَبَّكُمْ إِنَّهُ كَانَ غَفَّارًا) واتە داوای لێخۆشبون بکەن لە پەروەردگارتان، چونکە بێگومان ئەو زۆر لێبوردەیە..

- ﴿أَلَمْ تَرَوْا كَيْفَ خَلَقَ اللَّهُ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ طِبَاقًا ﴿١٥﴾ وَجَعَلَ الْقَمَرَ فِيهِنَّ نُورًا وَجَعَلَ الشَّمْسَ سِرَاجًا ﴿١٦﴾ وَاللَّهُ أَنْبَتَكُمْ مِنَ الْأَرْضِ نَبَاتًا﴾ نوح/١٥، ١٦، ١٧ واتە : ئایا نابینن چۆن خودای گەورە حەوت چینی ئاسمانی یەك لەسەر یەك بەدیهێناوەو مانگی لە ئاسمانی یەکەمدا وەك روناکیەك داناوەو رۆژیش وەك چرایەك، خودای گەورە لە خاك ئێوەی دروست کردوەو بە هۆیەوە وەك گژوگیا خواردن و توخمەکان لەزەوی وەردەگرن و گەشە دەکەن.

لە وەڵامدا کەس هەڵنەستاوە بە نوح بڵێت : (اللە) پەروەردگارمان نیەو زەوی و ئاسمانی بەدی نەهێناوەو ئێمەی دروست نەکردوەو یا بە بەڕێوەبردنی کاروباری زەوی و ئاسمان هەڵناستێ. هەروەها نکوڵیان لەوە نەدەکرد کە خودای گەورە پەرستراویانە، بۆیە نوح سەلامی خودای لێ بێ بانگی کردن و فەرموی: (مَا لَكُمْ مِنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُ) جگە لە خودای گەورە هیچ پەرستراوێکی ترتان نیە، ئەگەر نەتەوەکەی بە خودایەتی خودا کافر بونایە ئەوا بە شێوەیەکی تر بانگی دەکردن و دەیفەرمو (یا قوم اتخذوا الله الهاً) واتە: ئەی نەتەوەکەم (اللە) بکەن بەخودای خۆتان.

جا ئەوەی لێرەدا بە بیری توێژەرەوەدا دێت ئەم پرسیارەیە؛ باشە کە نەتەوەی نوح باوەڕیان بەبونی خوداو بەخودایەتی خودا هەبوە، ئەدی

لەسەرچی لەگەڵ نوحدا تێك دەگیران؟ ئەگەر بۆ ئەم مەسەلەیە لە ئایەتـەكانی قورئــان ورد بینــەوە بۆمــان دەردەكــەوێت كــە مشــتومڕ لــە نێــوانی نــوح و نەتەوەكەیدا لەسەر دو شت بوە :

یەكەم: پێغەمبەر نوح سەلامی خودای لێ بێت پێی دەگوتن ئـەو خودایـەی كـە پــەروەردگاری جیهانــەو دەزانــن ئێــوەو هــەمو جیهــانی بــەدی هێنــاوەو پێداویستیەكانتان جێبـەجێ دەكـات، لەراسـتیدا هـەر ئـەو پەرسـتراوەو دەبـێ بپەرسـترێ و هـیچ پەرسـتراوی دی لـە گۆڕێـدا نیـە. هـەر ئەویشـە كـە زەرەرو زیانتــان لەســەر لادەبــاو پێداویستیەكانتان جێبـەجێ دەكـات وگـوێی لـە هانـاو داواكاریی وداخوازییەكانتان دەبێ و بەدەنگتانەوە دێ. جا كـەوابو دەبـێ تـەنها ئەو بپەرستن و ملكەچی هیچ شـتێكی تـر یـا كەسـێكی تـر نـەبن و كڕنـوش بـۆ هیچ شتێك نەبەن تەنها بۆ ئەو نەبێ.

ـ ﴿يَـٰقَوۡمِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنۡ إِلَـٰهٍ غَيۡرُهُۥٓ﴾ واتــە : ئــەی نەتەوەكــەم، خــودا بپەرستن ، هیچ خودا و پەرستراوێكی ترتان نیە شایانی پەرستن بێ جگە لەو.

ـ ﴿وَلَـٰكِنِّي رَسُولٞ مِّن رَّبِّ ٱلۡعَـٰلَمِينَ ۝٦١ أُبَلِّغُكُمۡ رِسَـٰلَـٰتِ رَبِّي﴾ الـاعراف/٦١، ٦٢ واتــە : بــەلام مــن لەلایــەن پــەروەردگاری جیهانیانــەوە نێــردراوم و ئــەو پەیامانەتان پێ رادەگەیەنم كە خودا فەرمانی پێكردوم.

نەتەوەكەی سور بون لەسەر ئەوەی كە گومان لەوەدا نیە كە خودای گەورە پەروەردگاری جیهانیانە، بەلام چەند خودای داتاشراوی دی هەنە، كە هەنـدێك دەســەلاتیان هەیــە لــە بــەڕێوەبردنی ئــەم بونــەوەرەداو هەنــدێ لــە پێداویستیەكانمان جێبەجێ دەكەن، بۆیە هـەردەبێ باوەڕمـان وابـێ كـە لەگـەڵ (الله)دا ئەوانیش پەرستراوی ئێمەن و دەبێ باوەڕمان پێیان هەبێ.

ـــ﴿وَقَالُواْ لَا تَذَرُنَّ ءَالِهَتَكُمْ وَلَا تَذَرُنَّ وَدًّا وَلَا سُوَاعًا وَلَا يَغُوثَ وَيَعُوقَ وَنَسْرًا﴾ نــوح/٢٣
واتە: گوتیان دەست هەڵنەگرن لە خواکانتـان بەتایبـەتی ئـەو پێـنج بتـە (وەد، سواع، یەغوس، یەعوق، نەسر ).

دوەم: نەتــەوەی نــوح تــەنها ئەوەنــدە باوەڕیــان بــە پەروەردگاریــەتی (اللــە) هەبو لەو روەوە کە بەدیهێنەری ئەوان و عەردو ئاسمانەکانەو بەڕێوەبەری ئەم بونەوەرەیە، بەڵام باوەڕیان وا نەبو کە خودای گەورە بە تـەنها شایانی ئەوەیـە حـوکم و دەسـەڵاتی هەرەبـەرز لـە بـارەی رەوشـت و کۆمەڵیـەتی و شارسـتانی و رامیاری و لایەنەکانی تـری ژیانــەوە بەدەسـت ئـەو بـێ و یـا تـەنها ئـەو شـایانی ئەوە بێ رێنیشاندەر بێ و یاسادانەر بێ و فەرمان دەربکاو قەدەغەی خراپـەش بکا، پێویستە تـەنها گوێڕایـەڵی ئـەو بکرێت. بـەڵکو سـەرۆك وزاناکـانی خۆیـان لـەباتی خـودا کردبـوە پـەروەردگارو دەمڕاسـتی خۆیـان، لـەو کاروبارانــەی کـە لەوەپێش باسکران و نوح داوای لێ دەکردن و بانگی دەکردن کە تەنها خودا بـە پـەروەردگار بـزانن لـە هـەمو لایـەنێکی ژیـان و نـەك پەروەردگاریـەتی دابـەش بکەن لە نێـوان خـودا داتاشـراوەکانیان وە پێویسـتە لەسـەریان تـەنها (اللـە) بـە پەروەردگاری خۆیان بزانن بە هەمو ئەو مانایانەی کە وشەی (رب) دەیانگرێتە خۆی ، و شوێنی کەون و گوێڕایـەڵی بکـەن لـەو شـتانەی کـە لـە خـوداوە پێیـان رادەگەیەنێ کە نوح پێی دەفەرمون:

﴿إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴿١٠٧﴾ فَاتَّقُواْ اللَّهَ وَأَطِيعُونِ﴾ الشــــعراء/١٠٧، ١٠٨ واتـــــە : مــــن نێردراوی خودام بۆ ئێوە، دەستپاکم، چیم پێ رابگەیـەنرێ بـێ خیانـەت پێتـان رادەگەیەنم، جا لە خودا بترسن و بەگوێم بکەن .

## عاد ( نەتەوەی سەیدنا هود ) سەلامی خودای لیٚ بیٚت:

دوای نەتــەوەی نــوح، قورئــان باســی نەتــەوەی هــود دەكــا، دیــارە ئــەو نەتەوەیەش ملەجرەی ئەوەیان نەدەكرد كە خودا هەیە یا پەرستراوە، بەڵكو وەك نەتــەوەی نــوح باوەرِیــان بــە پەروەردگاریــەتی خــودا هــەبو لــە هەنــدیٚ لایەنــەوە، بــەلاّم كیٚشــەی هــود لەگــەلٚ گەلەكەیــدا لەســەر دو شــت بــو كــە لــە دەقەكانی قورئانا بە رونی بەدیار دەكەویٚ:

- ﴿وَإِلَىٰ عَادٍ أَخَاهُمْ هُودًا ۗ قَالَ يَا قَوْمِ اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُ﴾ الأعراف/٦٥

واتە : بۆ نەتەوەی عاد، براكەی خۆیانمـان بـۆ رەوانـە كـردن كـە هـود بـو، پیٚـی گوتن ئەی نەتەوەكەم، تەنها خـودا بپەرسـتن، چـونكە هـیچ خـوداو پەرسـتراوی ترتان نیە جگە لەو.

- ﴿قَالُوا أَجِئْتَنَا لِنَعْبُدَ اللَّهَ وَحْدَهُ وَنَذَرَ مَا كَانَ يَعْبُدُ آبَاؤُنَا﴾ الاعـراف/٧٠

واتە : بە هودیان گوت ئایـا بـۆ ئـەوە هاتویتـە لامـان (و بـەوە دەمانترسـیٚنی كـە سـزای توندوتیـژمان بـۆ دیٚ)، تـا (اللـە) بـە تـەنها بپەرسـتین و واز لـەو بتانـە بهیٚنین كە باوباپیرانمان دەیانپەرستن ؟

- ﴿قَالُوا لَوْ شَاءَ رَبُّنَا [1] لَأَنزَلَ مَلَائِكَةً﴾ فصــلت/١٤ واتــە : گوتیــان : ئەگــەر پەروەردگاری ئیٚمە ویستبای پیٚغەمبەر بنیٚـریٚ ئـەوا لـەباتی ئینسان فریشـتەی دەنارد بۆمان.

---

[1] سەیری وشەی (ربنا : پەرومردگاری ئیٚمە) بكەو بزانە چۆن باوەرِیان هەبوە بـەخوا لـەو لایەنەی كە بەدیهیٚنەرو دروستكەری ئاسمان و زەوی و مرۆڤەكانە.

﴿ وَتِلْكَ عَادٌ جَحَدُوا بِآيَاتِ رَبِّهِمْ وَعَصَوْا رُسُلَهُ وَاتَّبَعُوا أَمْرَ كُلِّ جَبَّارٍ عَنِيدٍ ﴾ هود/٥٩
واته : ئەمەش شوێنەواری نەتەوەی عادە، کە لایان داو نکوڵیان لە نیشانەو بەڵگەکانی پەروەردگاریان کردو ئێمەش تەفروتونمان کردن، ئەوانە لە پێغەمبەرانی خوا یاخی بون.. (بۆیە (عصوا) بەکۆ هاتوە کە ئیشارەتێکە بۆ ئەوەی کە لە هود سەلامی خودای لێ بێ یاخی بون وەکو ئەوە وایە کە لە پێغەمبەرانی پێش هود و پاش هود سەلامی خودای ان لێ بێ یاخی بوبن، چونکە هەموویان داوای یەکتاپەرستیان دەکرد). نەتەوەی عاد بەدوای فەرمانی سەرۆکە سەرسەخت و زاڵم و ملهوڕەکانیان کەوتن کە خوداش رێ بەمە نادا.

## سەمود ( نەتەوەی سەیدنا سالح ) سەلامی خودای لێ بێت:

دوای نەتەوەی عاد نەتەوەی سەمود دێت کە لە قورئاندا ئاماژەی پێکراوە، ئەم گەلە زاڵمترین و سەرکەشترین و یاخیترین نەتەوە بون. ئەمانەش گومراییەکەیان لە بنچینەو سەرەتادا وەکو گومرایی نەتەوەی نوح و هود سەلامی خودایان لێ بێت وابو، کە نکوڵی بونی خودایان نەدەکردو کافر نەبون بەوەی کە خودا پەرستراو پەروەردگاری هەمو بونەوەرە. بەڵکو دەیانگوت ئەمە تاکە پەروەردگار نیە لەم بونەوەرەو بە تەنها شایانی پەرستن نیەو کارهەڵسوڕان و دەسەڵات بە تەنها هی ئەو نیە، چەند خودای تریش هەن کە ئەوانیش گوێیان لە پاڕانەوەیان دەبێت و ناخۆشیان لەسەر لا دەبەن و داخوازیەکانیان جێبەجێ دەکەن.. هەروەها دەربارەی ژیانی شارستانی و خوڕەوشت هەر شوێنی زاناو گەورەو سەرۆکەکانیان دەکەوتن و یاسای ژیانیان لێ وەردەگرتن، هەر ئەمەش بوە هۆی ئەوەی کە لە دواییداو سەرەنجام ببن بە نەتەوەیەکی تێکدەرو خودای گەورەش وەبەر سزای خۆی خستن، هەمو ئەمەیش کە باسمان کرد لەو ئایەتانەی خوارەوەدا رون دەبێتەوە:

- ﴿ فَإِنْ أَعْرَضُواْ فَقُلْ أَنذَرْتُكُمْ صَٰعِقَةً مِّثْلَ صَٰعِقَةِ عَادٍ وَثَمُودَ ﴿١٣﴾ إِذْ جَآءَتْهُمُ ٱلرُّسُلُ مِنۢ بَيْنِ أَيْدِيهِمْ وَمِنْ خَلْفِهِمْ أَلَّا تَعْبُدُوٓاْ إِلَّا ٱللَّهَ قَالُواْ لَوْ شَآءَ رَبُّنَا لَأَنزَلَ مَلَٰٓئِكَةً فَإِنَّا بِمَآ أُرْسِلْتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ ﴾ فصلت/١٣، ١٤ واتـە: جا ئـەی موحەممـەد ئەگەر پشتیان لـەو بانگەوازە خودایيە هەڵگرد كە تۆ هێناوتـە، ئـەوا پێیـان بڵـێ هۆشـداریی سـزایەكی توندوتیژتان دەدەمێ، لـە شـێوەی دەنگێكی بـەهێز كـە لەخۆچـون و مردنـی تێـدا بێت، وەكو ئەوەی كە نەتەوەی عاد و سەمودی توش هات، كاتێ كە پێغەمبـەرەكان هـاتن بـۆ لایـان (پێغەمبـەری زۆریشـیان بـۆ هـاتبون) پێیـان گـوتن تـەنها خـودا بپەرستن و ئەوانیش گوتیان ئەگەر خـودا ویسـتبای ئـەوا چـەند فریشـتەیەكی بـۆ دەناردین تا ئاگادارمان بكەنـەوە نـەك ئینسانێكی وەك ئێـوەو ئێمـە باوەڕتـان پـێ ناهێنین.

ـ ﴿ وَإِلَىٰ ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَٰلِحًا قَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥ ﴾ هـود/٦١ واتـە : بـۆ نەتـەوەی سـەمود سـاڵحی برایانمـان نـارد بۆیـان، پێـی گـوتن ئـەی نەتەوەكەم لە خودای گەورە زیـاتر هـیچ خـوداو پـەروەردگاری تـرتـان نیـە، جا ئەو بپەرستن.

- ﴿ قَالُواْ يَٰصَٰلِحُ قَدْ كُنتَ فِينَا مَرْجُوًّا قَبْلَ هَٰذَآ أَتَنْهَىٰنَآ أَن نَّعْبُدَ مَا يَعْبُدُ ءَابَآؤُنَا ﴾ هود/٦٢ واتە: گوتیان ئەی ساڵح ئێمە بەر لەمە چاوەڕێی چاكەمان لێدەكردی، چما تۆ رێ نادەی ئەو شتانە بپەرستین كە باب و باپیرانمان پەرستویانە؟

- ﴿ إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ صَٰلِحٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٤٢﴾ إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴿١٤٣﴾ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴾ الشعراء/١٤٢-١٤٤ واتە: كاتێ كە ساڵحی برایان پێی گوتن: ئەرێ ئێوە لە خودا ناترسن؟ من نێردراوێكی دەست پاك و ئەمینی خودام و بۆ هۆشداریی

ئێوە نێردراوم، دە ئێوەش لەخوا بترسن و گوێڕایەڵی بکەن.

ــ ﴿ وَلَا تُطِيعُوٓاْ أَمۡرَ ٱلۡمُسۡرِفِينَ ﴿١٥١﴾ ٱلَّذِينَ يُفۡسِدُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَا يُصۡلِحُونَ ﴾ الشـعراء/ ١٥١، ١٥٢ واتە: گوێڕایەڵی سەرکردەو پێشەوا لە ڕێدەرچوەکان مەکەن، ئەوانەی تێکدەری سەر زەوی و گێرەشێوێنن و ئەهلی چاکەو چاکساز نین.

تەبەری دەفەرموێ: ئەو تێکدەرانە مەبەستی ئەم نۆ دەستەیە کە خودای گـــــەورە دەفـــــەرموێ : ﴿ وَكَانَ فِي ٱلۡمَدِينَةِ تِسۡعَةُ رَهۡطٖ يُفۡسِدُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَا يُصۡلِحُونَ ﴾.

## نەتەوەی سەیدنا ئیبراهیم سەلامی خودای لێ بێت:

دوای نەتەوەی سەمود نەتەوەی سەیدنا ئیبراهیم دێت سەلامی خودای لێ بێت، لێکدانەوەی دیدو باوەڕی ئەم نەتەوەیەش گرنگ و پێویستە، چونکە لەناو خەڵکیدا وا باوە کە نەمرود باوەڕی بەخودا نەبوەو داوای خودایەتی کردوە، بەڵام لە راستیدا باوەڕی بە بونی خودای گەورە هەبو، دەیزانی کە خـودا بەدیهێنـەرو کارهەڵسـوڕێنەری ئـەم بونەوەرەیـە، ئـەو تـەنها داوای خودایەتی بە مانای سێیەم و چوارەم و پێنجەم دەکرد، هەروەها خەڵکی وا حـاڵی بونـە کـە نەتـەوەی ئیـبراهیم سـەلامی خـودای لـێ بێـت نـە لـە روی خودایـەتی (الوهیـە) ونـە لـە روی پـەروەردگارێتی (ربوبیـە) وە خودایـان نەناسیوەو باوەڕیان پێی نەبوە..

لە واقیعدا حاڵی نەتەوەی سەیدنا ئیبراهیمیش سەلامی خودای لێ بێت، هەروەك حاڵی نەتەوەی نوح و عاد و سەمود بوە، لەوەدا کە ئەمانیش باوەڕیان بە خودا هەبو کە بەدیهێنەری ئەم بونەوەرەیە، هەروەها نکوڵیان لە پەرستنی نەدەکرد، بەڵام سەرلێشێواوێتی ئەمان لەوەدا بو کە ئەستێرەیان لە خودایەتیدا

دەکردە هاوەڵی خوداو پەروەردگاریەتیشیان بە مانای سێیەم و چوارەم و پێنجەم تایبەت کردبو بە سەرۆك و پیاوە گەورەو خاوەن دەسەڵاتەکانیان. دەقەکانی قورئانی پیرۆز بە شێوەیەکی ئاشکرا ئەم مەسەلە رون دەکەنەوە، بە جۆرێك ئینسان سەری سورِ دەمێنێ کە چۆن خەڵکی هەستیان بەم راستییە نەکردوەو کەمتەرخەمیان تیا کردوە؟ جا وەرە با بەر لە هەمو شتێك پێکەوە سەیری ئەو روداوە بکەین کە بەسەر ئیبراهیم داهات سەلامی خودای لێ بێت کاتێ لە سەرەتای پێگەیشتنیدا بو کە قورئان چۆنیەتی هەوڵ و تێکۆشانی پێغەمبەر ئیبراهیم رون دەکاتەوە بۆ گەیشتن بەراستی:

- ﴿فَلَمَّا جَنَّ عَلَيْهِ ٱلَّيْلُ رَءَا كَوْكَبًا ۖ قَالَ هَٰذَا رَبِّى ۖ فَلَمَّآ أَفَلَ قَالَ لَآ أُحِبُّ ٱلْءَافِلِينَ ﴿٧٦﴾ فَلَمَّا رَءَا ٱلْقَمَرَ بَازِغًا قَالَ هَٰذَا رَبِّى ۖ فَلَمَّآ أَفَلَ قَالَ لَئِن لَّمْ يَهْدِنِى رَبِّى لَأَكُونَنَّ مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلضَّآلِّينَ ﴿٧٧﴾ فَلَمَّا رَءَا ٱلشَّمْسَ بَازِغَةً قَالَ هَٰذَا رَبِّى هَٰذَآ أَكْبَرُ ۖ فَلَمَّآ أَفَلَتْ قَالَ يَٰقَوْمِ إِنِّى بَرِىٓءٌ مِّمَّا تُشْرِكُونَ ﴿٧٨﴾ إِنِّى وَجَّهْتُ وَجْهِىَ لِلَّذِى فَطَرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ حَنِيفًا ۖ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ﴾ الانعام/٧٦-٧٩ واتە: کاتێ کە شەو باڵی رەشی بەسەرا کێشا، ئەستێرەیەکی دیت و گوتی ئەمە پەروەردگارمە، تا بۆ نەتەوەکەی بسەلمێنێت کە ئەوانە خودا نین، کە بزر بو گوتی من شتی بزربوم خۆش ناوێ ،[1] و خودا نابێت ئەو سیفەتەی هەبێت[1].. کاتێ کە مانگی

---

([1]) ابو حیان لە کتێبی (بحر المحیط)دا دەڵێ : باسکردنی شتێك لەگەڵ بەرامبەرەکەت ئەگەر لەسەر ناهەق بو خۆت وا نیشان دەی کە لەسەر رای وی، ئینجا بەڵگەی بۆ بهێنیەوەو بیدەی بەزەویدا زۆر کاریگەرترە لەوەی تەنها بەڵگەی بۆ بهێنیەوە. جا ئەمەی پێغەمبەر ئیبراهیمیش سەلامی لێ بێ لەو جۆرەیە.

دیت هەڵهات گوتی ئەوەیان پەروەردگارمە، بەڵام کە ئەویش ئاوا بو گوتی ئەگەر پەروەردگارم ڕێم نیشان نەدا ئەوا دەچمە ریزی کۆمەڵی گومڕاو سەرلێشێواوانەوە، ویستی لە نەتەوەکەی بگەیەنێ کە لەسەر ڕێیەکی خراپن. ئەوجا کاتێ ڕۆژی بینی هەڵهات گوتی ئەمەیان گەورەترە ئەمە پەروەردگارمە، کاتێ ئاوابو گوتی : ئەی نەتەوەکەم ئەمن بێبەریم لەوەی کە هاوەڵ بۆ خودا بڕیار دەدەن و من ڕوم کردە ئەوەی کە ئەرزو ئاسمانەکانی بەدیهێناوە، ڕوکردنێکی پاك و تەواو و دور لە هاوەڵ پەیداکردن، من لە هاوەڵ پەیداکەران نیم.

لـەم ئایەتانـەی کـە هێڵیـان بـە بنـدا هێنـراوە بـەدیار دەکـەوێت کـە ئـەو کۆمەڵگەیەی پێغەمبەر ئیبراهیم سەلامی خودای لێ بێ تێیدا بو بیروبۆچونیان وابو کە ئاسمانەکان و زەوی بەدیهێنەرێکیان .. ئەگەرچی باوەڕیان بـە ئەستێرەو هەسارەی گەردونی وابو کە خوان، بـەڵام پێشیان وابـو کـە خـودای تـریش هەیـە، ئەوەش سەیر نیە چونکە نەتەوەکەی ئیبراهیم لـە نـەوەی ئـەو موسڵمانانە بـون کە باوەڕیان بە پەیامی پێغەمبەر نوح هێنابو، لەناو ئـەو نەتەوانـەی کـە نزیکی ئەوان بون لەکات و سەردەم و خزمایەتیدا لەسەر دەستی پێغەمبـەرە بـەڕێزەکان کـە یـەك لـەدوای یـەك دەهـاتن ئـاینی ئیسلام بـەردەوام زینـدو دەبـۆوەو نـوێ دەکرایەوە. وەکو خـودای گـەورە دەفـەرموێت : ﴿ إِذۡ جَآءَتۡهُمُ ٱلرُّسُلُ مِنۢ بَيۡنِ أَيۡدِيهِمۡ وَمِنۡ خَلۡفِهِمۡ ﴾ واتە : لە ناوخۆیان و دوای ئەوان پێغەمبەرمان بۆ ناردون بـەڵکو

---

(١) ئیبراهیم سلاوی خوای لێ بـێ ویسـتی تێیـان بگەیـەنێ کـە پـەروەردگار نـابێ ئـاڵوگۆڕ و گواستنەوەو گۆڕانکاری بەسـەردا بێـت، چونکە ئەمانـە لـە سیفاتی بـەدیهێنراوەکانن نـەك خوای بێ هاوتا .. (ئە.و)

لە هەمو لایەکەوە نێردراومان بۆ ناردون ،[1] بەو پێیە پێغەمبەر ئیبراهیم بیروبۆچون و تێڕوانینی ئەوەی کە (اللە) پەروەردگارو بەدیهێنەری ئاسمانەکان وزەویە، لەو دەوروبەر و ژینگەیەی وەرگرتبو کە تێیدا گەورە بوبو، و ئەو پرسیارەی کە لە دڵیدا بو بۆ گەیشتنە راستی ئەو بیروبۆچونە بو کە لەناو نەتەوەکەیدا بڵاوبو کە گوایا رۆژو مانگ و هەسارە گەڕۆکەکانی دی هاوبەش وهاوەڵی (اللە) ن لە پەروەردگارێتیدا تەنانەت لە پەرستن (عبادە)یشدا کردبونیان بە هاوەڵی خودا.[2]

جا ئیبراهیم سەلامی خودای لێ بێت پێش ئەوەی خودای گەورە هەڵی بژێرێت بۆ پێغەمبەرایەتی زۆر بە بڕشتانە هەوڵی فیکری خۆی خستەگەڕ تا وەڵامی ئەو پرسیارە بداتەوە. تا یاسای هەڵهاتن و ئاوابونی ئەستێرەکانی ئاسمان بوە هۆی گەیشتن بە راستیەکی واقیعی کە هیچ پەروەردگارێك نیە تەنها بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوی نەبێ.[3] هەر لەبەر ئەوە بو کە

---

(1) بەڵام پەروەردگارێتی (الربوبیة) بەمانای سێیەم و چوارەم و پێنجەم لە دیدی گەلی ئیبراهیمدا تەنها تایبەت بو بە چینی دەسەڵاتدار و فەرمانڕەوایان.. (ئە.و)

(2) ئەوەی پێویستە لێرەدا بگوترێ ئەوەیە ؛ هەڵکەندن و گەڕان بەدوای ئەو کاولگەو شوێنەوارانەی شاری (ئور)ە کە جێگەی پێغەمبەر ئیبراهیمە سەلامی خوای لێ بێت، ئەو شتانەی بەدەست کەتونە دەبنە بەڵگە بۆ ئەوەی کەوا ئەو نەتەوەیە مانگیان دەپەرست کە ناویان نابو (فنار) بەزمانی خۆیان لەدەوروبەری ئەوانیش نەتەوەیەك کە پایتەختەکەیان (الرسة) بو رۆژیان دەپەرست کە ناویان نابو (شەمماس) وە بناغەدانەری خێزانی دەسەڵاتدارێتی ئەو شوێنە ناوی (ئەرنمو) بو کە بەعەرەبی پێی دەگوترێ (نەمرود) و بەهەمو سەرۆکێکی ئەو ناوچەیە دەگوترا.

(3) لەتەفسیرەکانی (رازي، ابن كثیر، قرطبي، زەمەخشەری، ابن مسعود، بحر المحیط)دا هەمویان لەسەر ئەو رایەن کە ئیبراهیم - سەلامی خوای لێ بێت- کە ئەو پرسیارانەی کردوە بۆ گومان کردن نەبوە بەڵکو بۆ رون کردنەوەی حەقیقەت بوە بۆ میللەتەکەی. لە (صفوة التفاسیر، سورەتی انعام/٧٩) وەرگیراوە.

پێغەمبەر ئیبراهیم (١) سەلامی خودای لێ بێت لەگەڵ ئاوابونی مانگ گوتی ئەگەر خودای گەورە ڕێم پێ نیشان نەدا دەترسم هەروا بمێنمەوەو نەگەمە ڕاستی و منیش هەڵخەڵەتێم بەو ڕواڵەتانەی کە وەکو هەزارانی خەڵکی دەوروبەرم پێی خەڵەتاون. جا کە خودای گەورە بۆ پێغەمبەرایەتی هەڵیبژارد بانگی نەتەوەکەی بۆ خوداپەرستی و بەندایەتی کردنی خودای تاقانە کرد، واتە (الله).

بەوردبونەوە لەو وشانەی کە سەیدنا ئیبراهیم بە نەتەوەکەی دەگوت زیاتر ئەو شتانە بەدیار دەکەوێ کە باسمان کردن :

ــ ﴿ وَكَيْفَ أَخَافُ مَآ أَشْرَكْتُمْ وَلَا تَخَافُونَ أَنَّكُمْ أَشْرَكْتُم بِٱللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِۦ عَلَيْكُمْ سُلْطَٰنًا ﴾ الأنعام/٨١ واتە: کەی ئەمە شتێکی مەعقولە من لە بتەکانی ئێوە بترسم کە کردوتاننە هاوەڵی خوا، کەچی ئێوە لە خودای گەورە ناترسن کە هاواڵتان بۆی داناوە؟! خۆ خودای گەورە ڕێی ئەمەی نەداون..

ــ ﴿وَأَعْتَزِلُكُمْ وَمَا تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ ﴾ مریم/٤٨ واتە : لە خۆتان و هانابۆهێنراوانتان کەنارگیر دەبم کە لە شێوەی بت و سەنەمدا داتانتاشیون و لە جیاتی خودا دەیانپەرستن و لێیان دەپاڕێنەوە.

ــ ﴿ قَالَ بَل رَّبُّكُمْ رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ٱلَّذِى فَطَرَهُنَّ ﴾ الانبیاء/٥٦ واتە :

---

(١) ئەوەی تێبینی دەکرێت ئەوەیە کە وەرگێڕ لە باسی پێغەمبەرەکاندا سەلامی خوایان لێ بێت کاتێ ناویان ئەهێنێ ( سیفەت ) یان پێش دەخا لەسەر (ناو)یان: پێغەمبەر نوح ، پێغەمبەر ئیبراهیم..هتد.، بەڕای من (سیفەت)ەکە لەدوای (ناو)ەکەوە بێت وەك (ئیبراهیم پێغەمبەر، نوح پێغەمبەر..) باشترە، چونکە لە زمانی کوردیدا زیاتر ناو بەکار دەهێنرێت ، ئینجا سیفەتی بەدوایان ئەهێنرێت.. (ئە.و)

ئیـبراهیم گـوتی: بـەڵكو پـەروەردگارو خـودای ئێـوە كـە شـایانی پەرسـتن بـێ ، پەروەردگاری ئەرزو ئاسمانەكانە كە بەدیهێناون، نەك ئەو بت و سەنەمانە.

- ﴿ قَالَ أَفَتَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَنفَعُكُمْ شَيْـًٔا وَلَا يَضُرُّكُمْ ﴾ الانبیاء/٦٦ واتە ئیبراهیم گوتی : ئایا غەیری خودا دەپەرستن كە نە سودتان پێ دەگەیەنن و نە زیان.

- ﴿ إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِۦ مَاذَا تَعْبُدُونَ ﴿٨٥﴾ أَئِفْكًا ءَالِهَةً دُونَ ٱللَّهِ تُرِيدُونَ ﴿٨٦﴾ فَمَا ظَنُّكُم بِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾ الصافات/٨٥-٨٧ واتە : كاتێ سەیدنا ئیبراهیم بە باوكی و نەتەوەكەی فەرمو: بۆچی ئەو دارو بەردە لەباتی خودا دەپەرستن؟ بۆچی وا بەدرۆ و دەلەسە خۆتان ئیقناع كردوەو چەند خودای ەكی تر جگە لە خودای گەورە بەخوداتان داناون، كە دژوارترین چەواشەكارییە، چونكە ئەوانەی دەیانپەرستن لە بنچینەدا خودا نین، ئەو خەڵكە نەزانە بە خودایان داناون.. ئەدی گومانتان دەربارەی پەروەردگاری جیهانیان چییە؟ دەبێ لەو رۆژەی پێی دەگەنەوە چیتان لێ بكا؟ ئایا دەبێ وازتان لێ بێنێ و ئازارتان نەدات؟

- ﴿إِنَّا بُرَءَٰٓؤُاْ مِنكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ كَفَرْنَا بِكُمْ وَبَدَا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ ٱلْعَدَٰوَةُ وَٱلْبَغْضَآءُ أَبَدًا حَتَّىٰ تُؤْمِنُواْ بِٱللَّهِ وَحْدَهُۥٓ ﴾ الممتحنة/٤ واتە : ئێمە بێ بەرین لە خۆتان و لەو شتانەش كە لە غەیری خودا دەیانپەرستن، باوەڕمان پێتان نیەو باوەڕمان بەو ئایین و رێبازەش نیە كە لەسەرین، با بەردەوام دوژمنایەتی و ململانێ بكەوێتە نێوان ئێمە و ئێوەو دوژمنداریێتیمان لەیەك با ئاشكرا بێت، تا ئەو زەمانەی ئێوە واز لە كوفر دەهێنن و دێنە سەررێی خواویستی..

لە وتەکانی سەیدنا ئیبراهیمەوە دیارە کە جەنابیان نەتەوەیەك نادوێنێ کە (الله) نەناسن و نکوڵی لەوە بکەن کە خودایەو پەروەردگاری هەمو جیهانـە. وا دیار نیە کە زمین و مێشکیان بەتاڵ بێت لەو دیدو باوەڕانـە..سەیدنا ئیـبراهیم لەناو میللەتێکدا بو کە لەلایەنی پەروەردگارێتی (الربوبیە) بە مانـای یەکـەم و دوەم و لەلایەنی خودایـەتیش (الالوهیـە)وە هاوەڵیـان بـۆ خـودای گـەورە بڕیـار دابـو! بۆیـە لـە هـەمو قورئانـا وتەیـەکی ئیـبراهیم سـەلامی خـودای لـێ بێـت نادۆزیەوە کە بە نەتەوەکەی بڵێ باوەڕتان بە خـودای تـاك و تـەنها هـەبێت کـە پەرسـتراو پـەروەردگاری هـەمو جیهانـە تـا ئیقناعیـان کـات. بـەردەوام داوایـان ئەوەیان لێ دەکا کە تەنها خودا بەپەروەردگارو پەرستراو بزانن.

ئینجا با بێینە سەر باسی ئەو گفتوگۆیـەی کـە لـە نێوان نـەمرودو سـەیدنا ئیبراهیم پێغەمبەردا رویدا سەلامی حوای لێ بێت، کـە قورئـان لـەم ئایەتانـەدا بۆمان دەگێڕێتەوە:

ــ ﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِى حَآجَّ إِبْرَٰهِـۧمَ فِى رَبِّهِۦٓ أَنْ ءَاتَىٰهُ ٱللَّهُ ٱلْمُلْكَ إِذْ قَالَ إِبْرَٰهِـۧمُ رَبِّىَ ٱلَّذِى يُحْىِۦ وَيُمِيتُ قَالَ أَنَا۠ أُحْىِۦ وَأُمِيتُ ۖ قَالَ إِبْرَٰهِـۧمُ فَإِنَّ ٱللَّهَ يَأْتِى بِٱلشَّمْسِ مِنَ ٱلْمَشْرِقِ فَأْتِ بِهَا مِنَ ٱلْمَغْرِبِ فَبُهِتَ ٱلَّذِى كَفَرَ ﴾ البقـرة/٢٥٨ واتـە : ئـەرێ ئـەو کابرایـەت پـێ سـەیر نیـە کـە دەمـەدەمێ وشەڕەقسـەی لەگـەڵ ئیبراهیمـدا دەربارەی هەبونی پەروەردگار دەکرد؟ سەرەڕای ئەوەی کە خودای گەورە ماڵ و مـوڵکێکی زۆری پێـدابو، کـاتێ کـە ئیـبراهیم (لـە وەڵامـی نـەمرودا) گـوتی : پـەروەردگاری مـن ئـەو زاتەیـە کـە ژیـان بـە جەسـتەکان دەبەخشێ و دەشـیان مرێنێ، نەمرود گوتی: ئەمنیش دەژیێنم و دەمرێنم، دو پیاوی زیندانی هێنـاو یـەکێکیانی کوشـت و گـوتی ئـەوەم مرانـد و ئـەوی تریشـی ئـازادکرد و گـوتی: ئەوەشم زیندوکردەوە.. ئیبراهیم کە زانی ئەوەنـدە گێـل و نەفامـە بەڵگەیـەکی

دى بۆ هێنايەوە كە نەتوانێ رەتى كاتەوە، فەرموى: خوداى مـن سـاڵەهايە رۆژ لە رۆژهەڵاتەوە هەڵدێنێ، دەتۆش جارێـك لـە رۆژئـاواوە هـەڵى بێنـەوە؟ لێـرەدا ئەو بێ باوەڕە دەمى بوە تەڵەى تەقيو و ورتەى لێوە نەهات.

ئەوەى لـەم گفتوگۆيـە ئاشـكرا دەبـێ ئەوەيـە كـە كێشـەى نێـوان پێغەمبـەر ئيبراهيم و نەمرود ئەوە نەبو ئەم بفەرموێ خودا هەيەو ئەو بڵـێ نيـە، بـەڵكو ئەوە بو كە كێ بە پەروەردگار دەزانرێ؟ چونكە نەمرود لەناو گەلێكدا بـو كـە باوەڕى بەخودا هەبو. پاشان نـەمرود خـۆ شـێت نـەبو تـا ئـەو قسـە پڕوپـوچ و ناشيرينە بكات و بڵـێ : مـن بەديهێنـەرى ئاسمـان و زەويمـەو كارهەڵسوڕێنەرى مانـگ و رۆژم.

لەراسـتيدا مەبەسـتى ئـەوە نـەبو كـە بڵـێ مـن (اللـه) مـەو پـەروەردگارى ئاسمــانو زەويمــە، بــەڵكو مەبەســتى ئــەوەبو كــە ئــەو پــەروەردگارى ئــەو مەملەكەتەيــە كــە پێغەمبــەر ئيــبراهيم يەكێكــە لــە دانيشــتوانى.. داواى پــەروەردگارێتى نــەدەكرد بــە مانــاى يەكــەم و دوەم، چــونكە بــاوەڕى بــە پــــەروەردگارێتى رۆژو مــــانگ و ئەســــتێرەكان هــــەبو و داواكــــەى ئــــەو بــــۆ پەروەردگاريەتى بە ماناى سێيەم و چوارەم و پێنجەمى مانـاى (ربوبيـە)بـو تـا ئيعتيراف بە شەرعێتى خاوەنێتى و دەسەڵاتى ناڕاستەكردنى ئـەو مەملەكەتـەى دەست كەوێت.

بە واتايەكى دى مەبەسـتى ئـەو ئـەوە بـو كـە خـاوەنى ئـەو مەملەكەتەيـەو خەڵكەكەشى كۆيلـەو ژێردەسـتى ئـەون و دەسـەڵاتە مەركەزيەكـەى ئـەو كۆيـان دەكاتەوەو فەرمانى ئەو دەستورى ژيانيانە.

وشەكانى ئايەتى ﴿أَنْ ءَاتَىٰهُ ٱللَّهُ ٱلْمُلْكَ﴾ بەڵگەيەكى رونن كە خـاوەنێتى و دەســـەڵاتە سياســـيەكەى نـــەمرود خـــوا پێـــى بەخشـــيوە، بـــەڵام بانگەشـــەى

پەروەردگاریـــەتی خـــۆی هـــەر خۆهەڵكێشـــان و لاف لێـــدان و چەســـپاندنی فەرمانڕەوایـەتی و موڵكایـەتی خۆیـەتی.. بۆیـە كـە هـەواڵی درایـە كـە لـەناو ژێردەستەكانیدا پیاوێك پەیدا بوە نـاوی ئیبراهیمـەو بـاوەڕ بـە پـەروەردگاێتی رۆژو مانگ و ئەستێرەكان لە بازنەی ئەو دیوی سروشتەوە ناكات، هـەروەها لـە روی شارستانی و رامیاریشدا باوەڕ بە پەروەردگاریەتی پاشای سـەرتەختی ئـەو سەردەمە ناهێنێ، سەری سوڕماو بانگی كرد تا بزانـێ ئـەو كـێ بـە پـەروەردگار دەزانێ؟ جا هەر لە سەرەتاوە پێغەمبەر ئیبراهیم فـەرموی : پـەروەردگاری مـن یەكێكـە دەمــژێنێ و دەممــرێنێ و دەتــوانێ خــەڵكان بمــرێنێ و زیندوشــیان بكاتەوە! نەمرودیش هەستی بە بنج و بناوانی مەسەلەكە نەكرد، بۆیـە ویسـتی پەروەردگاریـەتی خـۆی بسـەلمێنێ بـەوەی كـە بڵـێ : منـیش مـردن و ژیـانم بەدەسـتە، بـە ئـارەزوی خـۆم كـێم بوێـت دەیكـوژم و خـوێنی دەڕێـژم! لێـرەوە ئیـبراهیم بـۆی رون كـردەوە كـە لای ئـەو هـیچ پـەروەردگارێك نیـە تـەنها ئـەو (الله)یە نەبێ كە بە هەمو ماناكانی پەروەردگارێتیەوە پەروەردگارە. جا چۆن یەكێك بەشی هەیە لـە پـەروەردگارێتی لـە كاتێكا كـە دەسـەڵاتی نـەبێ بەسـەر هەڵهاتن و ئاوابونی رۆژدا؟!

نەمرودیش پیاوێكی زیرەك بو هەر كە ئەو بەڵگە هەنجـەتبڕەی ئیبراهیمـی گوێ لێبـو زانـی كـە ئـەو بیروبۆچون و رایانـەی خـۆی لەسـەریەتی پڕوپوچـەو داواكردنـی پەروەردگاریـەتی لـەناو مـوڵكی خـودادا لاف لێـدان و داواكارییـەكی بەتاڵە. بۆیە دەمكوت بو، ورتەی لە دەم نەهاتە دەرەوە، بـەڵام لەگـەڵ ئەوەشـدا خۆپەرسـتی و ئارەزوبـازی و هەواپەرسـتی و بەرژەوەنـدی خێڵایـەتی هـەر وای لێكرد كە لەو دەسەڵاتەی خۆی نەیەتە خوارەوە تا بۆ گوێڕایـەڵی پـەروەردگارو پێغەمبەرەكەی بگەڕێتەوە، ئەگەرچی راستی و حەقیقەتیشی بۆ رون بوەوە.

لەبەر ئا ئەوەیە کە خودای گەورە دوای ئەم گفتوگۆیـە فـەرموی: ﴿وَٱللَّهُ لَا يَهْدِي ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾.. مەبەست ئەوەیە کاتێ نەمرود پاش ئـەوەی راسـتی بـۆ رون بوەوە رازی نەبو کە ئـەو رێگەیـە بگـرێ کـە دەبـو بیگرتبایـە، بـەڵکو هـەر لەسـەر دەسـەڵات و چەوسـاندنەوەو سـتەمکردنی خـۆی بـەردەوام بـو.. بۆیـە خودای گەورەش روناکی رێگەی خۆی پێ نەبەخشی! چونکە سوننەتی خـودا وا نیە یارمـەتی یـەکێك بـدا کـە نایـەوێت بێتـە سـەر رێگـای راسـت و هیدایـەت و رێنمایی خوا قبوڵ بکات.

## نەتەوەی ( لوط ) سەلامی خودای لێ بێت

لەپاش نەتەوەی ئیبراهیم لـەقورئانا نەتـەوەی سـەیدنا لـوت پێغەمبـەر دێـت کـە خـودای گـەورە سـەیدنا لـوتی بـۆ رەوانـە کـرد کـە بـرازای سـەیدنا ئیـبراهیم بوسەلامی خودایـان لـێ بێـت.. قورئـان ئـەوە رون دەکاتـەوە کـە ئـەوانیش نکـوڵی هەبونی خودایان نەدەکرد، نکوڵی ئەوەشیان نەدەکرد کە خودا ـ بەمانای یەکەم و دوەم ـ بەدیهێنـەرو پـەروەردگارە. بـەڵام ئـەوەیان نەدەسـەلماند کـە (اللـە) بـە پەروەردگار بەمانای سێیەم و چوارەم و پێنجـەم دابنـێن و بچـنە ژێـر دەسـەڵاتی ئەو پێغەمبەرەوە کە لەلایەن خوداوە رەوانە کـراوەو بەرنامـەی ژیـانی لـە لایـەن خـودای پـەروەردگاری جیهانیانـەوە هێنـاوە، کـە دەبـێ ملکـەچ بـن بـۆی.. ئـەوان دەیانویست چـی ئارەزویـان لـێبێ بیکـەن و حـەزی خۆیـان نەشـکێنن، ئـازادی بـێ قەید و شەرت. ئەمەش سەری کێشان بـۆ تاوانـە گـەورەکانیان کـە لـە ئەنجامیـدا توشی ئەو ئازارە سەخت و دژوارە بون کە بە فەتارەت چونە.. ئەوەی پشـتی ئـەو رایەمان دەگرێ ئەم دەقە قورئانیانەی خوارەوەیە:

﴿إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ لُوطٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٦١﴾ إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴿١٦٢﴾ فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٦٣﴾ وَمَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَى رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿١٦٤﴾ أَتَأْتُونَ الذُّكْرَانَ مِنَ الْعَالَمِينَ ﴿١٦٥﴾ وَتَذَرُونَ مَا خَلَقَ لَكُمْ رَبُّكُمْ مِنْ أَزْوَاجِكُمْ بَلْ أَنْتُمْ قَوْمٌ عَادُونَ﴾ الشـعراء/١٦١-١٦٦ واته : کاتێك کە لوتی برایان پێی گوتن ئایا لـە سزای خـودا ناترسـن؟ ئـەو کـارە ناپەسـەندو نابەجێیانـە دەکـەن؟ مـن نێردراوێکـی دەسـت و زمـان پـاکی خودای یم بۆ لای ئێوە نێردراوم، دە لە خودا بترسـن و گوێڕایـەڵیم بکـەن، خـۆ مـن لـە ڕێنمـایی ئێـوەدا هـیچ پاداشـتێکم لـە ئێـوە ناوێـت، پاداشـتی مـن لای پەروەردگاری جیهانیانە.. بۆچی واز لە هاوسـەرانتان دێـنن کـە پـەروەردگارتان بۆی دروست کردونەو بە نێرینە ئارەزوی جنسی خۆتان تێر دەکەن؟ بەڕاستی ئێوە کۆمەڵێکی دەستدرێژکارن (و سنوری حەڵاڵتان بەرەو حەرام بەزاندوە).

دەبیـنن هـەمان وشـەکانی سـەیدان نـوح و سـاڵح و هـود دوبـارە دەکاتـەوە، ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە کە پێغەمبەران سڵاوی خودای ان لێ بێت بانگـەوازیان یەکەو ئامانجیان یەکە، چونکە لە یەك سەرچاوەوە هاتوە.

شتێکی رون وئاشکرایە کە ئـەم جـۆرە قسانە لەگـەڵ نەتەوەیەکـدا نـاکرێن بڕوایان بە هەبونی خودا نەبێ و بە بەدیهێنەرو پەروەردگاری ئەو جیهانەی دا نەنێن، بۆیـە نـابینی وا وەڵامـی پێغەمبـەر لـوت بدەنـەوەو بڵـێن : خـودا چیـە؟ چۆن دەبێتە بەدیهێنەری ئەم جیهانە؟ یا چۆن بۆی هەیە ببێتە پـەروەردگاری ئێمەو هەمو بونەوەر؟ بەڵکو دەیانگوت :

ـ ﴿قَالُوا لَئِنْ لَمْ تَنْتَهِ يَا لُوطُ لَتَكُونَنَّ مِنَ الْمُخْرَجِينَ﴾ الشـعراء/١٦٧ واتـە : گوتیـان : ئـەی لـوت، ئەگـەر واز لـەو قسـانە نـەهێنی ئـەوا بـە دڵنیاییـەوە شـاربەدەرت دەکەین.

قورئـانی پـیرۆز ئـەم بابەتـەی لـە جێیـەکی تـردا بـەم وشـانەی خـوارەوە دەربڕیوە:

ـــ ﴿ وَلُوطًا إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِۦٓ إِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ ٱلْفَٰحِشَةَ مَا سَبَقَكُم بِهَا مِنْ أَحَدٍ مِّنَ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢٨﴾ أَئِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ ٱلرِّجَالَ وَتَقْطَعُونَ ٱلسَّبِيلَ وَتَأْتُونَ فِى نَادِيكُمُ ٱلْمُنكَرَ ۖ فَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِۦٓ إِلَّآ أَن قَالُوا۟ ٱئْتِنَا بِعَذَابِ ٱللَّهِ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴾ العنكبـوت/٢٨-٢٩ واتـە : پێغەمبـەر لـوت کـاتێ کـە بـە نەتەوەکەی گوت ئێوە کارێکی نابـەجێ دەکـەن کـە نێربازییـە! هـیچ یـەك لـە جیهانیـان لـە پـێش ئێـوەدا ئەمـە بەدییـەی نـەکردوە. ئێـوە نێربـازیی دەکـەن، رێگری دەکەن، لە کۆڕ و کۆمەڵگەتاندا شتی نابـەجێ دەکـەن، گاڵتـە بـە خـەڵکی دەکـــەن، مەگـــەر نـــازانن ئەوانـــە هـــەموی کـــردەوەی نابـــەجێن؟ ئـــەوان ئامۆژگاریەکانی لوتیان بە گوێیا نەچو، هیچ وەڵامێکیان نەبو تەنها ئەوە نـەبێ کە گوتیان ئەگەر راست دەکەی پێغەمبەری دە سزای خودامان بۆ بێنە.

ئایا ئەمە وەڵامی نەتەوەیەکە کە باوەڕی بە خودا نـەبێ؟ نەبـەخودا.. ئـەم قەومانە باوەڕیان بە بونی خوا هەبوە، بـەوەش هـەبوە کـە دەبـێ بپەرسـترێت، بەڵام لە پەرستنەکەدا هاوەڵیان بۆ داناون و لە پەروەردگارێتیشدا نەیانویستوە بێنەوە ژێـر دەسـەڵاتی یاسـاو رێسای شـەرعی پێغەمبـەران .. دیـارە کـە تـاوانی گەورەی ئەوان گوێڕایەڵی کردن و شوێنکەوتنی بەرنامەی غەیری بەرنامەکـەی خـودای گەورەیـە کـە بـە پێغەمبـەرانی بـەرێزی خۆیـدا بـۆی نـاردبون، لـە بەرامبـەردا فـەرمان و بەرهەڵسـتی (ئـەمرو نـەهی)سـەرکردەو دەمڕاسـت و دەسەڵاتی سیاسی خۆیان وەرگرتوەو کردویانەتە بەرنامەی ژیان، با پێچەوانەی وەحییش بوبێت.. ئەمەش لە دیتدارییدا قبوڵ نیە.

## نەتەوەی شوعەیب سەلامی خودای لیٚ بیٚت :

ئینجا با باسی خەڵکی مەدیەن بکەین کە بە (أصحاب الأیكة) واتە خاوەن دارستانی چڕوپڕ ناسرابون، ئەوانەی کە سەیدنا شوعەیبیان بۆ رەوانە کرابو، سەلامی خودای لیٚ بیٚ.. ئەوەی دەربارەیان دەزانین ئەوەیە کە ئەوانیش لە نەوەی سەیدنا ئیبراهیم بون، سەلامی خودای لیٚ بیٚ، کەوابیٚ پیٚویست ناکات لیٚبکۆڵینەوە داخوا باوەڕیان بە بونی خودا هەبوە یان نا؟ یا باوەڕیان بە پەروەردگاریەتی و خودایەتی خودا هەبوە؟ لە راستیدا ئەوانە نەتەوەیەکی موسڵمان بون، دوایی بە هۆی ئەوەی بیروبۆچونیان شیٚواو کردەوەیان خراپ بو لەڕیٚ دەرچون.. قورئانیش کە باسیان دەکا وا دەردەکەویٚ کە نەتەوەکە دوای ئەو هەمو خراپەکاریە خۆیان بە ئیماندار دەزانی، بۆیە شوعەیب سەلامی خودای لیٚ بیٚ جار لەدوای جار پیٚی دەگوتن ئەی گەلەکەم ئەگەر خۆتان بە ئیماندار دەزانن ئاوا بکەن و ئەوە بکەن.

لە وتویٚژی نیٚوان شوعەیب ونەتەوەکەی وەڵامدانەوەی نەتەوەکەیدا دەردەکەویٚ کە باوەڕیان بە خودا هەبوەو بە پەروەردگارو پەرستراویشیان دادەنا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا توشی دو جۆرە گومڕایی هاتبون:

یەکەمیان : قەناعەتیان وابو کە لەگەڵ خودای گەورەدا خوداوەندی تر هەنە لە بواری خودایەتی و پەروەردگاریٚتیدا. بەم شیٚوەیە خودا پەرستنیان پاك وبیٚگەرد نەبو.

دوەمیان : وایان دەزانی کە پەروەردگاریٚتی خودا لایەنەکانی ژیانی مرۆڤ لە روی رەوشت و کۆمەڵایەتی و ئابوری و شارستانی و سیاسییەوە ناگریٚتەوە. وایان دەزانی کە بە ئازادییەکی رەها لە ژیانی خۆیاندا سەربەستن تا بە ئارەزوی خۆیان بژین و چی بکەن وچی نەکەن . قورئانیش راستی ئەم

قسانەمان دەسەلمێنێ وەك دەفەرموێت :

ـــ ﴿وَإِلَىٰ مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْبًا ۗ قَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥ ۖ قَدْ جَآءَتْكُم بَيِّنَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ ۖ فَأَوْفُوا۟ ٱلْكَيْلَ وَٱلْمِيزَانَ وَلَا تَبْخَسُوا۟ ٱلنَّاسَ أَشْيَآءَهُمْ وَلَا تُفْسِدُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ بَعْدَ إِصْلَٰحِهَا ۚ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾ الـــاعراف/٨٥ واتـــە : شـــوعەیبمان بـــۆ لای خەڵکی مەدیەن رەوانە کرد، پێی گوتن : ئەی گەلی خۆم تەنها (الله) بپەرستن کە هیچ خودای ترتان نیە بێجگە لەو، بەرنامەیەکی پاك و پوخت و بەڵگەی زۆرو رونتان لە پەروەردگارتانەوە بۆ هاتوە (کە موعجیزەی سەر دەستی ئەو بو سەلامی خودای لێ بێ).. لە کێشان و پێواندا زوڵم لە کەس مەکەن و شتی خـــەڵکی مـــەخۆن و بـــە تـــەواوی بدەنـــەوە، پـــاش نـــاردنی پێغەمبـــەران و چاکســازییەکەی ئــەوان لەســەر زەوی مەکەونــە خراپــەکاریی و فەســاد بــڵاو مەکەنەوە.. ئەگەر باوەڕتان هەیە و دەڵێن ئیمانداریـن بەگوێم بکەن، بۆ خۆتان چاکە.

- ﴿وَإِن كَانَ طَآئِفَةٌ مِّنكُمْ ءَامَنُوا۟ بِٱلَّذِىٓ أُرْسِلْتُ بِهِۦ وَطَآئِفَةٌ لَّمْ يُؤْمِنُوا۟ فَٱصْبِرُوا۟ حَتَّىٰ يَحْكُمَ ٱللَّهُ بَيْنَنَا ۚ وَهُوَ خَيْرُ ٱلْحَٰكِمِينَ﴾ الاعراف/٨٧ واتە : مادام تاقمێکتان باوەڕی هێناوە بەوەی کە منی پێ نێردراوم و تاقمێکیش باوەڕی پێ نەهێناوە، دە چاوەڕوانی داوەرێتی خودا بن کە حوکمی خۆی لە نێوانماندا دەدات.. خوداش باشترین حاکم و داوەرە . ئەمەش مژدەی ئیماندارانی بە سەرکەوتن تێدایەو بەڵێنی بە فەتارەت چونی کافرانیشە..

- (وَيَٰقَوۡمِ أَوۡفُواْ ٱلۡمِكۡيَالَ وَٱلۡمِيزَانَ بِٱلۡقِسۡطِۖ وَلَا تَبۡخَسُواْ ٱلنَّاسَ أَشۡيَآءَهُمۡ وَلَا تَعۡثَوۡاْ فِي ٱلۡأَرۡضِ مُفۡسِدِينَ ﴿٨٥﴾ بَقِيَّتُ ٱللَّهِ خَيۡرٞ لَّكُمۡ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَۚ وَمَآ أَنَا۠ عَلَيۡكُم بِحَفِيظٖ ﴿٨٦﴾ قَالُواْ يَٰشُعَيۡبُ أَصَلَوٰتُكَ تَأۡمُرُكَ أَن نَّتۡرُكَ مَا يَعۡبُدُ ءَابَآؤُنَآ أَوۡ أَن نَّفۡعَلَ فِيٓ أَمۡوَٰلِنَا مَا نَشَٰٓؤُاْۖ إِنَّكَ لَأَنتَ ٱلۡحَلِيمُ ٱلرَّشِيدُ) هود/٨٥-٨٧ واتە : ئەی نەتەوەی خۆم با کێشانەو پێوانەتان دروست بێت، ماڵی خەڵکی مەخۆن وشتیان بە کەم کورتی مەدەنەوەو ئاژاوە مەنێنەوەو فەساد لە وڵاتدا بڵاو مەکەنەوە، گوێڕایەڵی خودا بکەن باشترەو ئەو حەڵاڵەی خودا بۆی دیاری کردون باشترە بیگرنەبەر وەك لەو حەرامەی کۆی دەکەنەوە، من چاودێر نیم بە سەرتانەوە، بەڵکو پێغەمبەرێکی خوام و پەیامی ئەوتان پێ ڕادەگەیەنم و ئامۆژگاریتان دەکەم. ئەوانیش بە گاڵتەپێکردنەوە گوتیان: ئەرێ شوعەیب! ئەوە نوێژەکەت وات لێ دەکا پێمان بڵێی دینی باوباپیرانتان جێبێڵن و ناهێڵی لە کێشانەو پێوانەشدا بە ئارەزوی خۆمان فڕوفێڵ بکەین؟[1].. هەر بۆ گاڵتە پێکردن پێیان گوت: بە ڕاستی تۆ کابرایەکی عاقڵ و زاناو دانای!

ئـەو ڕسـتانەی هێڵیـان بـە بنـدا هێنـراوە تایبـەتن بـە بەڵگـەی گومڕابـونی ڕاستەقینەیان لەلایەنی پەروەردگاریەتی و خودایەتیدا.

---

([1]) پێشـەوا فـەخری ڕازی دەفـەرموێ : شـوعەیب بـە دو شـت فـەرمانی بەگەلەکـەی کـرد: یەکەمیان بە یەکتاپەرستی، دوەمیشیان وازهێنان لە تەرازوبازی، ئەوانیش ئینکاریان کـردو بە دو بەهانە خۆیان لێبوارد: یەکەم بە تەنها خودا ناپەرستن چونکە نەریتی باوباپیرانیـان نەبوە، دوەم وازیش لە تەرازوبازی نـاهێنن چونکە مـاڵی خۆیانـە وتیایـدا ئـازادن ، جا (مـا یعبـد آباؤنـا) ئاماژەیـە بـۆ یەکتاپەرسـتی و (نفعـل في أموالنـا) ئاماژەیـە بـۆ وازهێنـانی تەرازوبازی. (صفوة التفاسير ٢٩/٢). (ئە.و)

## فیرعەون و دەست و پێوەندەکانی

ئینجا با پێکەوە لە قورئاندا لە چیرۆك و سەرگوزەشتەی فیرعەون و دەست و پێوەندەکانی ورد بینەوە، دەربارەی ئەو هەڵەو چەواشەکاریانەی کە بە ناو خەڵکیدا بڵاو بونەتەوە، ئەوەی دەربارەی فیرعەونە زیاترە لەوەی دەربارەی نەمرودو نەتەوەکەی بڵاو بو.. کە گوایە فیرعەون نەك هەر باوەڕی بە بونی خودا نەبوە، بەڵکو داوای خودایەتیشی دەکرد. مانای وایە ئەوەندە گێل بو کە بە ئاشکرا لە ناو خەڵکیدا دەیگوت من بەدیهێنەری ئاسمان و زەویمەو میللەتەکەشی ئەوەندە گێل و نەفام بون باوەڕیان پێ دەکرد! بەڵام لەو راستیەی کە قورئان و مێژو شایەدی بۆ دەدەن دەردەکەوێت کە گومڕایی ئەویش لە گومڕایی نەمرود چوەو جیاوازییان نەبوە، هەردوکیان هەر لە بواری خودایەتی و پەروەردگارێتیدا گومڕابون و گومڕایی شوێن کەوتوانی فیرعەونیش وەکو گومڕایی دەست و پێوەندو شوێنکەوتوانی نەمرود بوە، ئەگەر جیاوازیەك هەبێت ئەوەیە کە لەبەر هەندێ بارودۆخی سیاسی، ملهوڕیو دەمارگیری و نیشتمانپەروەری لە نێو دەست وپێوەندی فیرعەوندا بەرامبەر (بەنی ئیسرائیل)پەیدا ببو! کە ببوە بەربەستێك نەیدەهێشت ئەو نەفامانە باوەڕ بە خودایەتی و پەروەردگارێتی خودای باڵادەست بهێنن، ئەگەرچی لە دڵیانەوە باوەڕیان پێی هەبو وەکو زۆربەی بێباوەڕە مادديەکانی سەردەمی ئێستای ئێمە.[1]

---

(١)هۆی سەرەکی خۆ بەبێباوەڕ نیشاندانی زۆربەی خەڵکی ئەم زەمانە بۆ ئەو دەمارگیریە دەگەڕێتەوە کە ئیمپریالیزم لەدوای لەبەین چونی خەلافەتی ئیسلامی بەناو جیهانی ئیسلامیدا بڵاوی کردەوەو بەردەوام بونی داگیرکردنی هزر (غزو الفکری) کە بەهۆیەوە ئیسلام وەك داگیرکەر خرایە بەرچاوی بەناو رۆشنبیرەکانمان بەڵام زۆربەشیان دوای رونکردنەوەی ئیسلامی راستەقینەو روبەڕوبونەوەی واقیع دێنەوە سەر باوەڕبون بەخواو

رونكردنەوەی كورتی ئەم مەسەلەیە بەم شێوەیەیە :

كاتێ دەسەڵات كەوتە دەست سەیدنا یوسف سەلامی خودای لێ بێ هەمو هەوڵی بۆ ئەوە بو كە ئیسلام و رێنماییەكانی لە نێوانیاندا بلاوكاتەوەو لە سەر خاكی میسر ئاسەوارێكی وا پتەوی جێهێشت تا چەند سەدەیەك كەس نەیتوانی رەشی بكاتەوە.

هەرچەندە خەڵكی میسر هەمویان باوەڕیان بە ئیسلام نەهێنابو، بەڵام ناشتوانرێ بگوترێ مرۆڤی وایان تێدا مابو كە باوەڕی بە خودا نەبێ ونەزانێ كە خودا بەدیهێنەری ئاسمانەكان و زەویە. كاریش بەوەندە نەوەستا بەڵكو لە راستیدا ئیسلامەتی بە ڕادەیەكی وا كاری كردبوە سەر هەمو میسریەك هەر هیچ نەبێ باوەڕی وا بێ كە (الله) لەو دیوی سروشتەوە خودای هەمو بتەكان و پەروەردگاری هەمو خۆ بە پەروەردگار زانەكانە. لەسەر ئەو زەویە كەس نەمابو كافر بێ و باوەڕی بە خودایەتی (الله)ی باڵادەست نەبێ. بەڵام ئەوانەی كە لەسەر كافرێتی دەڕۆیشتن و بەردەوام بون لەسەری ئەوا لەگەڵ خودا(الله)دا چەند هاوەڵێكیان دانابو لە بواری خودایەتی و پەروەردگارێتیدا.. ئەم كاریگەریە جۆراوجۆرانەی ئیسلام هەر مابوەوە لەسەر خەڵكی میسر تا كاتی هاتنی سەیدنا موسا پێغەمبەر سەلامی خودای لێ بێت[1] بەڵگەش ئەو

---

قەناعەتی ئەوە كە ئیسلام بەرنامەی ژیانە، كەچی هەندێكیان لەبەر هەندێك ئیعتبارات بەكردەوە جێبەجێی ناكەن ئەگەرچی لەدڵەوەش قەناعەتیان هەیە . - وەرگێر.

(1) ئەگەر دەربارەی روداوە مێژوییەكان بڕوا بكەین بەوەی كە لەتەوراتدا هەیە ئەوا دەتوانین وا دانێین كە لەو كاتەدا پێنجیەكی خەڵكی میسر موسڵمان بون. ئەمەو تەورات باسی ئەوانە دەكات كە لەگەڵ پێغەمبەر موسا كۆچیان كرد دو ملیۆن نەفەر بون! باوەڕ مەكە خەڵكی میسری ئەو كاتە لە دە ملیۆن زیاتر بوبن. تەورات دەڵێ ئەوانەی كە لەگەڵ پێغەمبەر موسادا كۆچیان كرد هەمویان (بنی ئیسرائیل) بون، بەڵام چۆن لە ماوەی (٥٠٠) ساڵدا، دوازدە كوڕی یەعقوب سەلامی خوای لێ بێت بونە دو ملیۆن نەفەر، هەڵبەتە هەر

وتارەیە کە یەکێك لە میرەکانی قیبتی لـە کۆڕی فیرعەونـدا دای، ئـەوەش لـەو کاتەی کە فیرعەون بڕیاری کوشتنی سەیدنا موسای دا، ئەو میرە قیبتیە کە بـە نهێنی موسڵمان ببو، لە ناو میرەکانی کۆڕی فیرعەوندا خۆی پێنەگیراو هەستاو گوتی:

ـــ ﴿أَتَقۡتُلُونَ رَجُلًا أَن يَقُولَ رَبِّيَ ٱللَّهُ وَقَدۡ جَآءَكُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ مِن رَّبِّكُمۡۖ وَإِن يَكُ كَٰذِبٗا فَعَلَيۡهِ كَذِبُهُۥۖ وَإِن يَكُ صَادِقٗا يُصِبۡكُم بَعۡضُ ٱلَّذِي يَعِدُكُمۡۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي مَنۡ هُوَ مُسۡرِفٞ كَذَّابٞ ﴿٢٨﴾ يَٰقَوۡمِ لَكُمُ ٱلۡمُلۡكُ ٱلۡيَوۡمَ ظَٰهِرِينَ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَمَن يَنصُرُنَا مِنۢ بَأۡسِ ٱللَّهِ إِن جَآءَنَا﴾ غافر/٢٨-٢٩ واتە : ئایا پیاوێك دەکوژن کـە دەڵێت (الله) پەروەردگارو خودامە؟ لەگەڵ ئەوەشدا بەڵگەو موعجیزەی زۆری لەلایەن پەروەردگارتانەوە بۆ هێناون؟ خۆ ئەگەر درۆزن بێت ئـەوا زەرەری درۆیەکـەی هەر بۆ خۆیەتی و بـۆ ئێـوە نیـە، و ئەگـەر راستگۆش بێـت ئـەوا هەنـدێك لـەو هەڕەشانەی بە پەیمانی خودا پێی داون کە سزای خودای گەورەتان بۆ دێ ئـەوا حەتمەن توشتان دێت. بە ڕاستی خودا ڕێنمایی زیـادەڕۆ و لـەڕێ لادەر و درۆزن نادات.. ئـەی نەتەوەکـەم ئـەمڕۆ ئێـوە مـاڵ و مـوڵکێکی زۆرتـان بەدەستەوەیەو لەسەر زەویش دەسەڵاتدارن و دەست ڕۆیشتون، باشە ئەگەر سزای خودامـان بـۆ بێت کێ هەیە یارمەتیمان بدات و فورتارمان کات لێی؟

ـــ ﴿يَٰقَوۡمِ إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُم مِّثۡلَ يَوۡمِ ٱلۡأَحۡزَابِ ﴿٣٠﴾ مِثۡلَ دَأۡبِ قَوۡمِ نُوحٖ وَعَادٖ وَثَمُودَ

---

چەند تـەخمین کـەین ناگاتـە ئـەو ژمارەیـە . لەبـەر ئەمـە ئـەوەی پێوانـە پێویستی دەکات ئەوەیە کە ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکی میسر بڕوایان بەپێغەمبەر موسا هێنـابو و لەگەڵیانـدا کۆچیان کـرد. (مەبەسـت هـۆزو تیرەکـانی تـرە نـەك بـەنی ئیسـرائیل) جـا بـەهۆی هـەمو ئەمانەوە دەتوانین بزانین کە کاری بانگەوازی پێغەمبـەر یوسـف سـەلامی خـوای لیبێـت و جێنشینەکانی تا چ رادەیەك کاری کردبوە سەر وڵاتی میسر.

وَٱلَّذِينَ مِنۢ بَعۡدِهِمۡ ﴾ غافر/٣٠-٣١ واتە : ئەی نەتەوەکەم دەترسم وەکو ئەو دەستەو تاقمانەتان لێ بێت کە رێکەوتن دژی پێغەمبەران بوەستنەوە.. وەکو کافرانی نەتەوەی نوح و عاد و سەمود و ئەوانەی لە دوای ئەوان هاتن، وەك نەتەوەی لوت، بینیتان چۆن خودای گەورە لەبەینی بردن!!

- ﴿وَلَقَدۡ جَآءَكُمۡ يُوسُفُ مِن قَبۡلُ بِٱلۡبَيِّنَٰتِ فَمَا زِلۡتُمۡ فِي شَكّٖ مِّمَّا جَآءَكُم بِهِۦۖ حَتَّىٰٓ إِذَا هَلَكَ قُلۡتُمۡ لَن يَبۡعَثَ ٱللَّهُ مِنۢ بَعۡدِهِۦ رَسُولٗا ﴾ غافر/٣٤ واتە : پێشتر یوسفتان بە چەندین موعجیزەی ئاشکراوە بۆ هات، کەچی تا ئێستاش بەرامبەری هەر لە گوماندان! کاتێ کۆچی دواییشی کرد گوتتان دوای ئەو هەرگیز خودا هیچ پێغەمبەرێکی دیکە نانێرێ.

ـ ﴿وَيَٰقَوۡمِ مَا لِيٓ أَدۡعُوكُمۡ إِلَى ٱلنَّجَوٰةِ وَتَدۡعُونَنِيٓ إِلَى ٱلنَّارِ ٤١ تَدۡعُونَنِي لِأَكۡفُرَ بِٱللَّهِ وَأُشۡرِكَ بِهِۦ مَا لَيۡسَ لِي بِهِۦ عِلۡمٞ وَأَنَا۠ أَدۡعُوكُمۡ إِلَى ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡغَفَّٰرِ ﴾ غافر/٤١-٤٢ واتە ئەی نەتەوەکەم بۆچی من داوای ئەوەتان لێ دەکەم و بانگتان دەکەم کە باوەڕ بهێنن بە خودای تاك و تەنیا کە دەتانبا بەرەو رزگاری و بەهەشت و ئێوەش بەرەو ئاگری دۆزەخم بانگهێشت دەکەن؟! داوام لێ دەکەن کە بێ باوەڕ بم بەخوا و هاوەڵی بۆ پەیدا بکەم و دەتانەوێ کەسانێ بکەم بە هاوبەشی (وەکو فیرعەون) کە من وا نازانم شیاوی بن! من دەمەوێت ئێوە باوەڕ بەو خودای ە بهێنن کە کەس زاڵ نابێ بە سەریدا.. کە تۆبەی تەوبەکارانیش وەردەگرێ.

سەرەتاو کۆتایی ئەم وتارە شایەتی ئەوە دەدات کە کاریگەریی کەسایەتی سەیدنا یوسف سەلامی خودای لێ بێت هێشتا لە دەرونی نەتەوەکەدا تا ئەو کاتەی ئەم وتوێژە روی داوە هەر مابو، ئەگەرچی چەندین چەرخی بەسەردا رۆیشتبو.

بەهۆی ئەو زانستەی ئەو پێغەمبەرە بەڕێزە سەلامی خودای لێ بێت فێری کردبون، لە رادەیەکی وا نەفامیدا نەمابونەوە کە هیچ شتێك لە بونی (اللە) نەزانن، یا نەزانن کە ئەو پەروەردگارو خودایەو دەسەڵاتی بەسەر هێزی سروشتدا زاڵەو دەبێ لێی بترسن و خۆی لێ بپارێزن.

هەروەها لە رستەی کۆتایی ئەم وتارەدا بە دیاردەکەوێ کە نەتەوەی فیرعەون بە تەواوی نکوڵی پەروەردگاریەتی و خودایەتی (اللە)یان نەدەکرد، بەڵکو گومڕاییەکەیان وەکو گومڕایی نەتەوەکانی تر بو کە لەمەو پێش باسمان کردن، واتە ئەو نەتەوەیەش لە بواری پەروەردگاریەتی و خودایەتیدا هاوەڵی بۆ خودا (اللە) بڕیار دابو.

بەڵام ئەوەی کە گومان لە فیرعەون پەیدا دەکا کە بڕوای بە هەبونی خودا نەبوبێ ئەو پرسیارەیە کە کاتێ گوێی لە موسا پێغەمبەر بو دەیفەرمو: ﴿إِنَّا رَسُولُ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ من نێردراوی پەروەردگاری جیهانیانم، گوتی: ﴿وَمَا رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ پەروەردگاری جیهانیان چیە و کێیە؟ ئینجا ئەوەی کە بە هامانی وەزیری گوت : ﴿ٱبْنِ لِى صَرْحًا لَّعَلِّىٓ أَبْلُغُ ٱلْأَسْبَٰبَ ﴿٣٦﴾ أَسْبَٰبَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ فَأَطَّلِعَ إِلَىٰٓ إِلَٰهِ مُوسَىٰ﴾ واتە: قەڵایەکی بەرز و قوڵلەیەکم سەختم بۆ دروست بکە تا بگەمە هۆکارەکان، واتە بگەمە هۆکارو رێگاکانی ئاسمان، تا بچمە لای خودای موسا! هەروەها ئەو هەڕەشەیەی کە لە سەیدنا موسای کرد : ﴿لَئِنِ ٱتَّخَذْتَ إِلَٰهًا غَيْرِى لَأَجْعَلَنَّكَ مِنَ ٱلْمَسْجُونِينَ﴾ ئەگەر بێجگە لەمن بە خودا بگری بەندت دەکەم و ئەو جاڕەی بۆ نەتەوەکەی دا ﴿أَنَا۠ رَبُّكُمُ ٱلْأَعْلَىٰ﴾ من پەروەردگاری هەرە بەرزتانم و ئەو قسەیەی کە بە دەست وپێوەند و پیاوماقوڵانی خۆی گوت:

﴿مَا عَلِمْتُ لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرِي﴾ نەمزانیوە بێجگە لەمن خودایەکی ترتان هەبێت.. بەم وتانە خەڵکی وا تێدەگەن کە فیرعەون باوەڕی بەهەبونی خودای گەورە نەبوەو هیچ بۆچونێکی دەربارەی پەروەردگاری جیهانیان نەبوەو هەر خۆی بەتاکە خودا داناوە، بەڵام لە راستیدا پاڵنەری ئەم قسانەی پێشەوەی فیرعەون تەنها دەمارگیری نیشتمانپەروەری بو، چونکە لەکاتی سەیدنا یوسفدا سەلامی خودای لێ بێت هەر ئەوەندە نەبو کە بەهۆی کەسایەتیە بەرێزو بەهێزەکەی ئەو زاتە بیروباوەڕی ئیسلام لەخاکی میسر بڵاوبێتەوە، بەڵکو کوڕانی یەعقوب (بنی ئیسرائیل) بەهۆی دەسەڵات و قسەڕۆیشتنی سەیدنا یوسفەوە سەلامی خودای لێ بێت لە ناو حکومەتی میسردا دەسەڵاتێکی تەواویان هەبو، و حوکمیان بەسەر میسردا سێ بۆ چوار سەدە مایەوە.

ئینجا هەستی دەمارگیری نیشتمانپەروەری و نەتەوەپەرستی (ناسیونالیزم)[1] لە دڵی میسریەکاندا جوڵایەوەو تێڕوانینێکی رەگەزپەرستییان بۆ دروست بو بەرامبەر بە گەلی بەنی ئیسرائیل (نەوەو وەچەی کوڕانی یەعقوب)، ئەم هەستە توند بو تا وای لێهات دەسەڵاتی (بەنی ئیسرائیل)یان نەهێشت و بنەماڵە نیشتمانپەروەرە میسریەکان دەسەڵاتیان گرتە دەست و یەك لەدوای یەك حوکمیان کرد، ئەو پاشا نوێیانەی کە حوکمیان گرتە دەست بەوەندە نەوەستان کە کوڕانی یەعقوبیان ژێربار کرد و بێ هێزیان کردن، بەڵکو هەوڵیان دا هەمو شوێنکارێکی سەردەمی سەیدنا یوسف سەلامی خودای لێ بێت بسڕنەوەو خونەریتی ئایینە نەفامیەکەی خۆیان زیندو بکەنەوە. جا کاتێك کە خودای گەورە سەیدنا موسای سەلامی خودای لێ بێت بۆ ناردن،

---

(1) هەرچەندە ناسیونالیزم ئەو کاتە بەو شێوەیەی ئێستا وەك فیکرەیەك نەبوە کە لە چەرخی شازدەهەمی ئەوروپا هاتە کایەوە. - وەرگێڕ-

ترسان لەوەی کە جارێکی دی دەسـەڵات بکەوێتـەوە دەست جولەکـەکان.. ئەمـە هۆی ئـەو رەفتـارە لـوت بەرزییـەی فیرعەونـە کـە بـەتورەیی و تێخوڕینـەوە لـە سەیدنا موسا بپرسێ: ﴿وَمَا رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾؟ واتە: خودای جیهانیـان کێیـە؟ ئـەو مل بادانەی بۆ ئەوە بو دەسەڵات هەر لە دەست حۆیدا بمێنێتەوە.. فیرعەون لە هـەبونی خـودای گـەورە بـێ ئاگـا نـەبو، ئەمـەش بـە جـوانترین شـێوە لـە گفتوگۆیـەکانی فیرعـەون و قسـەی پیاوماقوڵـان و وتـەکانی سـەیدنا موسـا پێغەمبەردا سەلامی خودای لێ بێت دەر دەکەوێ بۆ نمونە فیرعەون بۆ داکۆکی کردن لەو قسەیەی خۆی کە موسا پێغەمبەر سەلامی خودای لێ بێت نێردراوی خـودا نیـە دەڵـێ: ﴿ فَلَوْلَآ أُلْقِيَ عَلَيْهِ أَسْوِرَةٌ مِّن ذَهَبٍ أَوْ جَآءَ مَعَهُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ مُقْتَرِنِينَ ﴾ الزخـرف/٥٣ واتـە: ئەگـەر موسـا سـەلامی خـودای لـێ بێـت پێغەمبەرە بۆچی وەکو سەرکردەو گەورە پیـاوانی ئێمـە چەند بـازنێکی زێـڕی لە دەستدا نیە؟ چونکە سەرۆکەکانی ئەوان دو بازن و تەنێکی زێڕیان لەدەست دەکـرد! یـا بۆچـی کۆمـەڵێ فریشـتە لەگـەڵیا نـەهاتون پارێزگـاری بکـەن و پشتیوانی لێبکەن؟

ئایا کابرایـەکی مێشك بـەتاڵ دەربـارەی بـونی خـوداو فریشتە ئـەم قسانە دەکات؟

لە شوێنێکی دیدا قورئان چیرۆکی گفتوگۆی نێوان موساو فیرعـەونمان بـەم شێوەیە بۆ دەگێڕێتەوە:

- ﴿فَقَالَ لَهُۥ فِرْعَوْنُ إِنِّي لَأَظُنُّكَ يَٰمُوسَىٰ مَسْحُورًا ﴿١٠١﴾ قَالَ لَقَدْ عَلِمْتَ مَآ أَنزَلَ هَٰٓؤُلَآءِ إِلَّا رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ بَصَآئِرَ وَإِنِّي لَأَظُنُّكَ يَٰفِرْعَوْنُ مَثْبُورًا ﴾ الاسراء/١٠١-١٠٢ واتـە : فیرعـەون بـە پێغەمبـەر موسـای گـوت: وابـزانم جادویـان لێکـردوی

وتێکچوی! ئەویش فەرموی: تۆ باش دەزانی کە خودای ئەرزو ئاسمانەکان ئەو نۆ نیشانەی بۆ ناردونە خوارەوە تا پەندی لێ وەرگرن و بگەڕێنەوە لای ئەو شاهێدیشن لەسەر راستی قسەکانی من، من وادەزانم ئەی فیرعەون تۆ بەهیلاك دەچی و خەسارەتمەند دەبی.

لە شوێنێکی دیدا خودای گەورە قسەی شاراوەی ناو دڵی نەتەوەی فیرعەون دەردەخات، کە دەفەرموێ: ﴿ فَلَمَّا جَآءَتۡهُمۡ ءَايَٰتُنَا مُبۡصِرَةٗ قَالُواْ هَٰذَا سِحۡرٞ مُّبِينٞ ١٣ وَجَحَدُواْ بِهَا وَٱسۡتَيۡقَنَتۡهَآ أَنفُسُهُمۡ ظُلۡمٗا وَعُلُوّٗاۚ ﴾ النمل/١٣،١٤ واتە : کە نیشانە دیارو ئاشکراکانی ئێمەیان گەیشتە لا و دیتیان (موعجیزەکانی سەیدنا موسا سەلامی خودای لێ بێت) گوتیان ئەمە سیحرێکی ئاشکرایەو نکوڵیان لێکردو باوەڕیان پی نەهێنا، لەگەڵ ئەوەش لە دڵەوە دەیانزانی کە لەلایەن خوداوە هاتوە. ئەمەش زوڵمێك بو لە خۆیان کرد، چونکە خۆیان بە گەورەتر دەزانی و ملهوڕییان دەکرد لەوەی شوێنی هەق کەون.

هەروەها قورئان کۆڕێکی ترمان دەخاتە بەرچاو کە سەیدنا موساو دەست و پێوەندەکانی فیرعەونی تێدا کۆدەکاتەوە بەم ئایەتە کە دەفەرموێ:

ــ ﴿ قَالَ لَهُم مُّوسَىٰ وَيۡلَكُمۡ لَا تَفۡتَرُواْ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبٗا فَيُسۡحِتَكُم بِعَذَابٖۖ وَقَدۡ خَابَ مَنِ ٱفۡتَرَىٰ ٦١ فَتَنَٰزَعُوٓاْ أَمۡرَهُم بَيۡنَهُمۡ وَأَسَرُّواْ ٱلنَّجۡوَىٰ ٦٢ قَالُوٓاْ إِنۡ هَٰذَٰنِ لَسَٰحِرَٰنِ يُرِيدَانِ أَن يُخۡرِجَاكُم مِّنۡ أَرۡضِكُم بِسِحۡرِهِمَا وَيَذۡهَبَا بِطَرِيقَتِكُمُ ٱلۡمُثۡلَىٰ ﴾ طـه/٦١-٦٣ واتە : سەیدنا موسا بە کۆمەڵی ساحیرانی فەرمو: ئەی هەش بەسەرینە! بە دەم خودای گەورەوە درۆ هەڵمەبەستن، بە تایبەتی کە دەزانن ئەمانە موعجیزەی خودان و سیحر نین.. مەڵێن سیحرە، دوایی بەهیلاکتان دەبا، هەرکەسێ درۆ هەڵبەستێ بەهیلاك دەچێ و زەرەرمەند دەبێ.. ئەوانیش بەم قسەیە ترسیان

لێ نیشت وبونە دو بەش: هەندێکیان بە نهێنی دەیانگوت: ئەمە ساحیر نیە، ساحیر قسەی وا ناکات، هەندێکیشیان دەیانگوت: بەدی ساحیرە! هەتا لەسەر ئەوە رێکەوتن کە بەخەڵکی بڵێن ئەم دوانە (سەیدنا موساو هارونی برای سەلامی خودای ان لێ بێت) دو ساحیرن و دەیانەوێ وڵاتەکەی خۆتان لەدەست دەربهێنن و خۆشتان وەدەرنێن و لە دینی خۆشتان کە باشترین رێبازتانە دەرتان بهێنن.

ئەوەی لەم ئایەتە بەدەردەکەوێ ئەوەیە کاتێ کە سەیدنا موسا سەلامی خودای لێ بێت ساحیرەکانی بە سزای خوداو خراپی سەرەنجامیان لەم بەدرۆخستەوەیەدا ترساند، هیچ کێشەو بگرەوبەردە لە نێوان سەیدنا موساو ساحیرەکاندا روی نەدا، ئەوەش لەبەر ئەوەبو کە هێشتا ئاسەواری گەورەیی و دەسەڵاتی خودا لە دڵی ساحیرەکاندا هەر مابو، بەڵام حاکمە نیشتمانیەکان ئاگاداریان کردنەوە کە ئەگەر شوێنی موسا بکەون و دەسەڵات بکەوێتە دەست بەنی ئیسرائیلیەکان ئەوا کودەتایەکی سیاسی گەورە رو دەداو فەرمانڕەوایی میسر دەکەوێتەوە دەست بەنی ئیسرائیلیەکان، بۆیە دڵیان رەق بو و هەمویان لەسەر ئەوە رێکەوتن کە بەربەرەکانی ئەو دو پێغەمبەرە پێشەوایە سەلامی خودای ان لێ بێت بکەن.

دوای رون بونەوەی ئەم راستیە بە ئاسانی دەتوانین بچینە ناو ئەم لێکۆڵینەوەیەوە کە کێشەی نێوان سەیدنا موساو فیرعەون لەسەر چی بو؟ جۆری ئەو گومڕاییەی کە فیرعەون و نەتەوەکەی لەسەری بون چی بو؟ فیرعەون بە چ مانایەکی (رب) داوای خودایەتی و پەروەردگاریەتی دەکرد؟

با پێكەوە بیر لە یەكە بەیەكەی ئەم ئایەتانەی خوارەوە بكەینەوە :

١ـ پیاوماقوڵانی فیرعەون : ئەوانەی دەیانویست بانگەوازی سەیدنا موسا لەریشەوە دەربهێنن لەمیسر، لە دیدو بەرژەوەندی خۆیانەوە پرسیاریان لە فیرعەون دەكرد:

﴿أَتَذَرُ مُوسَىٰ وَقَوْمَهُۥ لِيُفْسِدُواْ فِى ٱلْأَرْضِ وَيَذَرَكَ وَءَالِهَتَكَ﴾ الاعراف/١٢٧ واتە : ئایا واز لە موساو نەتەوەكەی دێنیت كە ئاوا لە وڵاتدا خراپە و ئاژاوە بنێنەوە و واز لە پەرستنی تۆو خودایەكانت بهێنن؟

بە پێچەوانەی ئەمانەوە، ئەو موسوڵمانەی باوەڕی بە سەیدنا موسا هێنابو پێی دەگوتن : ﴿ تَدْعُونَنِى لِأَكْفُرَ بِٱللَّهِ وَأُشْرِكَ بِهِۦ مَا لَيْسَ لِى بِهِۦ عِلْمٌ ﴾ المؤمن/٤٢ واتە: ئێوە من بانگهێشتی كافربون دەكەن! دەتانەوێت بە نەزانی بكەومە شیركەوەو هاوەڵ بۆ خوا پەیدا بكەم؟!!

ئەگەر لەم دو ئایەتە وردبینەوەو بەڵگەی مێژویی و شوێنەواری نەتەوە كۆنەكانی میسری سەردەمی فیرعەونی بخەینە پاڵ، بۆمان دەردەكەوێ كە فیرعەون و نەتەوەكەی بە مانای یەكەم و دوەمی وشەی (الرب)، هاوەڵیان بۆ خودا پەیدا كردبو و بت و سەنەمیان كردبوە هاوەڵی خوداو دەیانپەرست، دیارە ئەگەر فیرعەون خۆی بە پەروەردگاری سەروی جیهانی سروشت دابنایە، واتە وای دەربخستایە كە لەم جیهانەدا زاڵە بەسەر سیستمی هۆكارەكان و بێجگە لەو لە ئاسمانەكان و زەویدا هیچ خودای دی نەبێ، ئەوا بەهیچ جۆرێك بت و سەنەمی نەدەپەرست.[1]

---

([1]) هەندێك لە لێكدەرەوە (مفسر)ی قورئان وشەی (آلهتك) بەو شێوەیە دەخوێننەوە (إلاهتك) واتە (عبادتك)، وا تێ دەگەن كە فیرعەون داوای ئەوەی كردوە كە بەدیهێنەری

ئەرزو ئاسمانەکانە.. جا مانای ئایەتەکە بەگوێرەی لێکدانەوەی ئەوان وای لێ دێت: ( ئایا واز لە موساو نەتەوەکەی دەهێنی تا نەتپەرستن؟) بەڵام هەندێ شت هەیە دەبێ ئاگاداری بین، وەك :

١- (إلاهتك) ریزپەڕ (شاذ) ەو پێچەوانەی خوێندنەوەی باوی قورئانخوێنەکانە.

٢- ئەو مەبەستەی کە لێکدەرەوانی قورئان ئەو خوێندنـەوەیان بـۆ هەڵبـژاردوە بەڵگەیـەکی بەهێزی نیە.

٣- رەنگە (إلاهە) بە مانای بتێکی مێ بێت ، سەرەڕای مانای (عیبادەت)، بەڵام ئاشکرایە کـە خـوای هەرەبـەرزی میسـریە کۆنـەکان رۆژ بـو کـە بـە وشـەی (رع) ناویـان دەبـرد و وشـەی (فرعون) مانای جێگری رۆژە یا روکاری رۆژە واتە ئەوەی فیرعـەون داوای دەکـرد ئـەوە بـو کە ئەو رواڵەتێکی مادی ئەو رۆژەیە . تەواوبو.

(طبري) رەحمـەتی خـوای لـێ بێـت لـە تەفسـیرەکەیدا بـەرگی ١ لا ٤١-٤٢، بـەرگی ٩ لا ١٧ دا دەڵێ : ئیبن عەباس و موجاهید رەحمەتیان لێ بێـت بـە (لاهتـك)یـان خوێندۆتـەوە، بـەڵام (طـبري) بـەلاوازی دانـاوەو گوتویـەتی ئـەو خوێندنـەوەی کـە زۆربـەی خـەڵکی لەسـەرینە (إلاهتك) نیە بەڵکو (آلهتك)ە بە بەڵگەی یەکدەنگی قورئان خوێنەکان لەسەر ئەو رایە .

هەروەها طبري لێکدانەوەی ئەو خوێندنـەوەی لـە ئـیبن عەباسـەوە لـە چـەند رویەکـەوە گێڕاوەتـەوە لەبـەرگی ٩ لا ١٨ دەفـەرموێ (ویـذرك وآلهتـك) واتـە (عبادتـك) و وتویـەتی فیرعەون دەپەرستراو کەسی نەدەپەرست، لەلایەکی ترەوە لێـی گێڕدراوەتـەوە بـەمانای (واز لەپەرستن بهێنێ) ئەمەش ئەوە هەڵدەگرێ کە مانای ملکەچ نەکردنی بـێ بـۆ فەرمانـەکانی فیرعەون.

هەروەها ئەو رایەی مامۆستا مـەودودی کـە ئـەو خوێندنەوەیـە دەکـرێ (إلاهـە) بـەمانای جینسی مێی (الـه) هاتبێ هـەر تەبـەری گێڕایتیـەوە، هەرچـەندە دوبارە بـەلاوازی دانـاوەو فەرمویـەتی: هەنـدێکیان دەڵـێن ئـەوەی دەخوێنێتـەوە (إلاهتـك) مەبەسـتی وەکـو مانـای (آلهتك)ە، بەڵام ئەوە (مؤنث)ەو بەمەبەستی یەك خوایە.

جا ئەوەی رای مامۆستا مـەودودی بـەهێز دەکـات ( هەرچـەندە تەبـەری بـە لاوازی دانـاوە) ئەوەیە کە میسریەکان رۆژیان بە خوا دادەناو لە زمانی عەرەبی بەوشـەی (الألاهة) هـاتوە. هـەروەها طـەبـەری لـە تەفسـیرەکەیدا بـەرگی ٩ لا ١٨ شـیعری ( بنـت عتیبـة بـن حـارث الیربوعي) بە بەڵگە هێناوەتەوەو دەڵێ :

تروحنا من اللعباء عصراً      واعجلنا الألاهة أن تؤوبا

٢ـ بـەڵام ئـەو وشـانەی فیرعـەون گوتویـەتی کـە لـە قورئانـدا هـاتوە وەك ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمَلَأُ مَا عَلِمۡتُ لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرِي﴾ القصص/٣٨ واتە : ئـەی پیـاو ماقوڵ و گەورەپیاوان، هیچ خودایەك شك نابەم غەیری خۆم کە پەرستراوتان بێت.

ئیبن عەباس دەفەرموێ : لە نێوان ئەم قسەو قسەکەی تری کە وتـی : ﴿أَنَا۠ رَبُّكُمُ ٱلۡأَعۡلَىٰ﴾ چل ساڵی پێ چو، ئـەو دوژمـنی خودایـە درۆی کـردو دەیزانـی کـە خودایەکی بە دەسەڵات هەیەو ئەرزو ئاسمان و ئەویشی دروست کردوە.

ـــ ﴿قَالَ لَئِنِ ٱتَّخَذۡتَ إِلَٰهًا غَيۡرِي لَأَجۡعَلَنَّكَ مِنَ ٱلۡمَسۡجُونِينَ﴾ الشـــعراء/٢٩ واتـــە : گوتی: ئەی موسا ئەگەر خودایەکی دی جگـە لـە مـن بگریـت و بپەرستی، ئـەوا بەندت دەکەم.

لەوەشدا فیرعەون مەبەستی ئەوە نەبوە کە هەرچی (آلهة) هـەبێت غـەیری خۆی رەتی کاتەوە، بەڵکو مەبەستی پوچکردنەوەو بەدرۆخستنەوەی بانگەوازی سەیدنا موسا بو سەلامی خودای لێ بێت.

کاتێ سەیدنا موسا بـو سـەلامی خـودای لـێ بێـت بانگەشـەی ئـەوەی دەکـرد دەســەڵاتی خـودا نـەك هـەر تـەنها لـە سـەروی سروشـتەومیە، بـەڵکو خـاوەنی

---

تەبەری فەرمویەتی: (الألاهة) لێرەدا بەمانای رۆژ هاتوە ، هەروەها قاموسەکان لە مانـای (الالاهە) مانای بت و مـانگ و رۆژیـان لێـك داوەتـەوە. بروانـە (القـاموس المحيط) و (لسان العرب) لە وشەی (اله) وە (المخصص) ١٩/٩.

هەروەها (طبرسي) لە تەفسیری (مجمع البيـان) بـەرگی ٣ لا ٤٤٦دا دەڵێ : (ابـن جـنی) دەڵێ : رۆژ بـە (الألاهـة) نـاونرابو چـونکە دەیانپەرسـت ، ئەمانـەش هـەموی رایـەکانی مامۆسـتا مەودودی بەهێز دەکەن و دەیچەسپێنن.

فەرمانکردن و بەرهەڵستی کردنەو بە مانای سیاسی و شارستانێتی خاوەنی دەسەڵاتی زاڵ و سەروەرییە. فیرعەون بە نەتەوەکەی دەگوت : وا نازانم جگە لە من خودایەکی لەو شێوە هەبێ کە موسا باسی لێوە دەکات، هەڕەشەشی دەکرد..

ئەوەی لەم ئایەتانەوە بەدیار دەکەوێ و بەڵگەی مێژویی و شوێنەواری نەتەوە کۆنەکان پشتگیری دەکەن ئەوەیە کە فیرعەونەکانی میسر نەك هەر خۆیان بە فەرمانڕەوای هەرمبەرز دادەنا، بەڵکو خۆیان بە پاك و پیرۆز و بەڕێز دادەنا، ئەویش بە هۆی خۆ وەپاڵدانیان بە بت و خوداوەندەکانی ترەوە، ئەمەشیان بۆ ئەوە بو کە خۆیان بگەیەننە ناو دڵ و دەرونی خەڵکە رەشۆکیەکەو بەسەر گیانیاندا زاڵ بن.. تەنها فیرعەونەکان ئەم داوایەیان نەکردوە، بەڵکو تا ئێستاش زۆربەی بنەماڵە حوکمدارەکان جگە لە حوکم کردنیان لەلایەنی سیاسیەوە ئەم داوایە دەکەن وەك هاوبەشی کردنێك جا زۆر بێ یا کەم لە خودایەتی و پەروەردگارێتی خودای گەورەدا لە بازنەی ئەودیوی سروشتەوە، بۆیە دەبینی داوا لە خەڵکی رەش وروت و جەماوەر دەکەن هەندێ دروشمی بەندایەتی لەبەردەمیاندا ئەنجام بدەن، کەچی لە راستیدا ئەم بانگەشەیان بۆ خودایەتی ئاسمانی مەبەستی بنچینەییان نیە، بەڵکو بۆ چەسپاندنی دەسەڵاتە سیاسیەکەی خۆیانە، بۆیە دەبینین ئێستاشی لەگەڵدا بێت خێزانە حوکمدارەکان لەمیسرو ناوچە نەفامیەکانی دی بە نەمانی دەسەڵاتە سیاسیەکەیان ئەو خودایەتیەکەشیان دەڕوا و لەگەڵ کورسیەکە ئەم دەست و ئەو دەست دەکا.(١)

---

(١) ئاسەواری ئەم دیاردەیە تا ئێستاش بەرچاو دەکەوێ بەتایبەت لەبن حوکمی دیکتاتۆرەکاندا. - وەرگێڕ-

٣ـ بانگەشـەی فیرعـەون بـۆ خودایـەتی ئـەوە نـەبو كـە ئـەو بەسـەر هـەمو یاسایەكی سروشتدا زاڵەو ئەو بەڕێوەی دەبات، بـەڵكو مەبەستی خودایـەتی لـە بواری سیاسەتدا بو و بە مانای سێیەم و چوارەم و پێنجەمی وشەی (الرب) وای دادەنـا كـە ئـەو سـەرۆك و گـەورەی هەرەبـەرزی میسـرە، بۆیـە دەیگـوت ئـەمن خاوەنی خاكی میسرم و بەروبومەكەشی هـی منـە، كەوابێ هـەر خـۆم شایانی ئـەوەم كارهەڵسوڕێنم تیایـدا، و كەسـایەتیە مەركەزیەكـەی وڵات خـۆمم كـە بنچینەی پێكەوەگرێدانی میسرە، بۆیـە نابێت هیـچ یاسـایەكی دی بێجگـە لـە یاسای من بـەڕێوە ببرێـت.. بنـەماو بنچـینەی داواكـەی فیرعـەون بـە دەربـڕینی قورئانی بەم شێوەیە بو:

﴿وَنَادَىٰ فِرۡعَوۡنُ فِي قَوۡمِهِۦ قَالَ يَٰقَوۡمِ أَلَيۡسَ لِي مُلۡكُ مِصۡرَ وَهَٰذِهِ ٱلۡأَنۡهَٰرُ تَجۡرِي مِن تَحۡتِيٓۚ أَفَلَا تُبۡصِرُونَ﴾ الزخرف/٥١ واتە : فیرعەون بەناو گـەورەپیاوانی قیبتیدا بڵاوی كردەوەو گوتی: ئەی نەتەوەكەم ! ئایا موڵك و دەسـەڵاتی میسـر هەموی هی من نیـەو ئـەو روبـارو جۆگەلانـە بـەژێر كۆشـكەكەمدا نـاڕۆن؟ ئایـا نابینن چ دەسەڵاتێكم هەیە؟

هەر ئەو بنچینەیەش بـو كـە بانگـەوازی پـەروەردگارێتی نـەمرودی لەسـەر بنیـــــات نرابــــــو ﴿أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِي حَآجَّ إِبۡرَٰهِـۧمَ فِي رَبِّهِۦٓ أَنۡ ءَاتَىٰهُ ٱللَّهُ ٱلۡمُلۡكَ﴾ البقرة/٢٥٨ واتە : ئایا هەواڵی ئەو كەسەت پێنەگەیشتوە كە موناقەشەی لەگەڵ پێغەمبەر ئیبراهیم دەربارەی پەروەردگاری دەكرد؟ ئەوەش بەهۆی بەخۆنازین و لەخۆبایی بونی بو بەو دەسەڵات و موڵكەی كە خودای گەورە پێی دابو.

هەر ئەو دیدو روانگەیەیە كـە فیرعـەونی هاوچـەرخی پێغەمبـەر یوسـف ـ سەلامی خودای لێ بێت ـ لێیـەوە داوای پـەروەردگارێتی لەسـەر ژێردەسـتەكانی

دەکات.

٤. بەڵام بانگەوازەکەی موسا پێغەمبەر سەلامی خودای لێ بێت کە لەگەڵ فیرعەون و دارودەستەکەیدا بوە هۆی ململانێ و دوبەرەکی، ئەوە بو کە هیچ خوداو پەروەردگارێك نیە تەنها (الله) نەبێت بە هەمو ماناکانی وشەی (رب)، تەنها ئەو لە جیهانی سەروی سروشتەوە خوداو پەروەردگارەو لە روی کۆمەڵایەتی وسیاسیشەوە هەر خوداو پەروەردگارە، بۆیە دەبێ تەنها ئەو بپەرسترێ و کەسی تر بێجگە لەو بە گوێڕایەڵی کردن و پەرستن تایبەت نەکرێ ، و دەبێ تەنها دەستورو یاسای ئەو لە هەمو کاروبارە جۆراوجۆرەکانی ژیاندا پیادە بکرێ..

خودای گەورە سەیدنا موسای رەوانە کردوە بەڵگەی پێغەمبەرایەتی لە شێوەی موعجیزەدا پێیەو فەرمان و نەهیەکانی خۆی بە وەحی بۆ رەوانە کردوە، بۆیە دەبێ بەڕێوەبردنی کاروباری بەندەکان لە دەست ئەودا بێ نەك فیرعەون. لێرەدا فیرعەون و سەرانی حکومەتەکەی جار لەدوای جار دەنگیان لێ بەرز دەبۆوەو دەیانگوت: موسا و هارون هاتونەو دەیانەوێ وڵاتی میسرمان لە دەست دەربهێنن و یاساو دەستوری ئایینی و شارستانیەتیمان بگۆڕن بە یاساو دەستوری دی بە پێی ویستی خۆیان.

- ﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مُوسَىٰ بِـَٔايَٰتِنَا وَسُلْطَٰنٍ مُّبِينٍ ﴿٩٦﴾ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَمَلَإِيْهِۦ فَٱتَّبَعُوٓاْ أَمْرَ فِرْعَوْنَ وَمَآ أَمْرُ فِرْعَوْنَ بِرَشِيدٍ ﴾ هود/٩٦، ٩٧ واتە : موسامان بە بەڵگەو نیشانەکانی خۆمانەوە بۆلای فیرعەون و دارودەستەکەی نارد ، ئەوانیش گوێیان بە بانگەوازە خودای یەکە نەداو شوێن فەرمانی فیرعەون کەوتن، فەرمان و رێگەی فیرعەون لارو وێرەو ناتەواوەوعاقڵانە نەبو.

ـ (وَلَقَدْ فَتَنَّا قَبْلَهُمْ قَوْمَ فِرْعَوْنَ وَجَاءَهُمْ رَسُولٌ كَرِيمٌ، أَنْ أَدُّوا إِلَي عِبَادَ اللهِ إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ، وَأَنْ لَا تَعْلُوا عَلَى اللهِ إِنِّي آتِيكُمْ بِسُلْطَانٍ مُبِينٍ) الـدخان/ ١٧-١٩ واتـە : پـێش هـاوەڵ پەیداكـەرانی قـورەیش فیرعـەون و نەتەوەكـەیمان تـاقی كردەوە، كاتێ كە موسامان بۆ رەوانە كردن كە پیـاوێكی خانـەدان و بـەرێز بـو، بـە فیرعـەو داروەدستەكەی فـەرمو: ئـەو بەندانـەی خـودا (بـەنی ئیسـرائیل)م لەگەڵدا بنێرن وئازاریان مەدەن، من رەوانـەكراوێكی ئەمینی خـودام، خـۆ بـەزل مـەزانن لـەوەی كـە حـوكمی خـودا جێبـەجێ كـەن، مـن بـە بەڵگـەی ئاشـكراوە رێنمایی رێگەی راستم بۆ هێناون كە هەمو خاوەن عەقڵێك دانی پێدا دەنێ كـە من راستگۆم و نێردراوی خودام.

ـ ﴿إِنَّآ أَرْسَلْنَآ إِلَيْكُمْ رَسُولًا شَٰهِدًا عَلَيْكُمْ كَمَآ أَرْسَلْنَآ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ رَسُولًا ﴿١٥﴾ فَعَصَىٰ فِرْعَوْنُ ٱلرَّسُولَ فَأَخَذْنَٰهُ أَخْذًا وَبِيلًا﴾ المزمل/١٥،١٦ واتـە : هۆ قورەیشینە، ئێمە پێغەمبـەرێكمان بـۆ نـاردون تـا شـاهێدی لـەخودا یـاخی بونتـان بێـت، هـەر وەك كـە پێشـتر پێغەمبەرمان بۆ لای فیرعەون رەوانە كرد، بـەڵام فیرعـەون یـاخی بـو، ئێمـەش بـە شـێوەیەكی سـەخت گرتمـان و لـە بـەینمان بـرد، شـێوەیەك كـە بەخـەیاڵی كەسـدا نـەدەهات، ئێـوەش لـە خۆتـان بترسـن كـە بـەهیلاك بچـن ئەگـەر لـە موحەممەد ﷺ یاخی بن.

ـ﴿ قَالَ فَمَن رَّبُّكُمَا يَٰمُوسَىٰ ﴿٤٩﴾ قَالَ رَبُّنَا ٱلَّذِىٓ أَعْطَىٰ كُلَّ شَىْءٍ خَلْقَهُۥ ثُمَّ هَدَىٰ ﴾ طـه/٤٩-٥٠ واتە : فیرعەون گوتی: ئەی موسا، ئەو خودایەی ئێوە كە منی بـۆ بـانگ دەكـەن كێیە؟ نەیگوت خودای من، چونكە زۆر كەللەرەق بـو، دایـە پـاڵ موسـاو هـارون، سەیدنا موسـا فـەرموی: پـەروەردگاری ئێمـە ئـەو خودایەیـە كـە هـەمو شـتێكی بەدیهێناوەو ژیانی پێ بەخشیوەو پاشان رێنمایی چۆنیەتی ژیانەكەشی كردوە.

ـــ ﴿ قَالَ فِرْعَوْنُ وَمَا رَبُّ ٱلْعَـٰلَمِينَ (٢٣) قَالَ رَبُّ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَآ إِن كُنتُم مُّوقِنِينَ (٢٤) قَالَ لِمَنْ حَوْلَهُۥٓ أَلَا تَسْتَمِعُونَ (٢٥) قَالَ رَبُّكُمْ وَرَبُّ ءَابَآئِكُمُ ٱلْأَوَّلِينَ (٢٦) قَالَ إِنَّ رَسُولَكُمُ ٱلَّذِىٓ أُرْسِلَ إِلَيْكُمْ لَمَجْنُونٌ (٢٧) قَالَ رَبُّ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ وَمَا بَيْنَهُمَآ إِن كُنتُمْ تَعْقِلُونَ (٢٨) قَالَ لَئِنِ ٱتَّخَذْتَ إِلَـٰهًا غَيْرِى لَأَجْعَلَنَّكَ مِنَ ٱلْمَسْجُونِينَ ﴾ **الشـعراء/ ٢٣-٢٩ واتــە :**

**فیرعــەون گــوتی: حەقیقــەتی ئــەو خودایــەی تــۆ چــیەو چــۆنە کــە دەڵێــی پـــەروەردگاری جیهانیانـــە؟ ســەیدنا موســا فــەرموی: پـــەروەردگاری ئـــەرزو ئاسمانەکان و ئەوەی لە نێوانیاندایە ئەگەر باوەڕی پێ دەکەن.. فیرعەون بە دەوروبەرەکەی گوت: گوێتان لێیە چ دەڵێ؟ من پرسیاری پەروەردگارەکەی لێدەکەم کە حەقیقەتەکەی چۆنە، ئەو باسی سیفاتەکەی دەکات.. سەیدنا موسا سەلامی خودای لێ بێت بەڵگەی دوەمی بۆ هێناوەو فەرموی: پەروەردگاری ئێوەو بەدیهێنەری ئێوەو باوباپیرانتانە.. ئەمەش بەڵگەیەکی کاریگەرتر بو، بۆیە فیرعەون نەیتوانی بەرپەرچی بداتەوە، بۆیە گوتی: بەراستی ئەو پێغەمبەرەی بۆ ئێوە ڕەوانە کراوە شێتە!! سەیدنا موساش سەلامی خودای لێ بێت بەڵگەیەکی بەهێزتری بۆ هێنایەوە بۆ سەلماندنی پەروەردگارێتی خودای گەورەو فەرموی: ئەو پەروەردگارەی ڕۆژ لە ڕۆژهەڵاتەوە هەڵدێنێ و لە ڕۆژئاواوە ئاوای دەکا، ئەوە زەقترین بەڵگەیە ئەگەر ئێوە عەقڵتان هەبێ، هەر ئەو بەڵگەیەش بو کە سەیدنا ئیبراهیم سەلامی خودای لێ بێت نەمرودی پێ بەزاند و ورتەی لە دەم نەهاتە دەرەوە. فیرعەون کە زانی هیچی بۆ نەمایەوە لە بەرامبەر ئەو بەڵگە بەهێزانەدا، گوتی : ئەگەر هەر پەروەردگارێکی دی جگە لە من هەڵبژێری ئەوا زیندانیت دەکەم و هەتا دەمری لە بەندیخانە توندت دەکەم.**

- ﴿ قَالَ أَجِئْتَنَا لِتُخْرِجَنَا مِنْ أَرْضِنَا بِسِحْرِكَ يَـٰمُوسَىٰ ﴾ طه/٥٧ واتـه : گـوتی: ئـەی موسا! ئایا بـۆ ئـەوە هاتویـە لامـان کـە بـەو سیحرەت لـە خـاکی میسـر دەرمـان کەی؟

ــ ﴿وَقَالَ فِرْعَوْنُ ذَرُونِيٓ أَقْتُلْ مُوسَىٰ وَلْيَدْعُ رَبَّهُۥٓ ۖ إِنِّيٓ أَخَافُ أَن يُبَدِّلَ دِينَكُمْ أَوْ أَن يُظْهِرَ فِي ٱلْأَرْضِ ٱلْفَسَادَ ﴾ غـافر/٢٦ واتـه : فیرعـەون گـوتی: لـێم گـەڕێن بـا موسا بکوژم، (خۆی وا پیشاندا کە لەبەر دڵی وان نایکوژێ، بەڵام لە راستیدا لـە ترسی ئەوەبو نەوەك سزای خودای بۆ بـێ) ئینجـا بـا موسـا بـانگی خودایەکـەی بکات و رزگاری کـا، دەترسـم دینەکـەتان لـێ بگـۆڕی یـا ئـاژاوەو شـەڕ لـە وڵاتـدا بنێتەوە..

ـــــــ ﴿ قَالُوٓاْ إِنْ هَـٰذَٰنِ لَسَـٰحِرَٰنِ يُرِيدَانِ أَن يُخْرِجَاكُم مِّنْ أَرْضِكُم بِسِحْرِهِمَا وَيَذْهَبَا بِطَرِيقَتِكُمُ ٱلْمُثْلَىٰ ﴾ طه/٦٣ واته : ساحیرەکان دوای وتوێژ لە نێوان خۆیـان هاتنـە سەر ئەوەی بڵێن کە ئەم دو ساحیرە دەیانەوێ بـە هـۆی ئـەو سیحرەی دەیکـەن لــە خــاکی میســر دەرتــان کــەن و ئــەو رێگــە راســتەتان لــێ بشــێوێنن کــە ســیحرکردنەو لــە بــن دەســتتان دەری بێــنن و بــە هۆیــەوە بــبن بــە خــاوەن دەسەڵات.

بە وردبونەوە لـەو ئایەتانـەی یـەك لـەدوای یـەك هێنامـان دەردەکـەوێ کـە هەمان ئەو گومڕاییەی کە هەر لە کۆنەوە نەتەوە جیاجیاکانی تێکەوتبو بـاڵی کێشـابو بەسـەر دۆڵـی نیلـدا، وە بانگـەوازی سـەیدان موسـاو هـارون سـەلامی خودایان لـێ بێـت هـەمان بانگـەوازی پێغەمبـەرەکانی پێشوتر بـو کـە هـەر لـە کۆنەوە خەڵکیان بۆ بانگ دەکرد.

## جولەكەو دیانەكان:

دوای باسكردنی شوێنكەوتوانی فیرعەون، دەگەینە باسی بەنوئیسرائیل و نەتەوەكانی تر كە ئایینی جولەكەو دیانیان[1] هەڵگرتبو، ئەوانە هیچ گومانیان لێناكرێ كە باوەڕیان بە خودای جیهانیان نەبوبێ یا باوەڕیان بەخودایەتی و پەروەردگاریەتی (اللە) نەبوبێ، هەر ئەمە بەسە بۆ بەڵگە كە قورئان بە خاوەن كتێبیان دادەنێ بەڵام ئەو پرسیارەی بە مێشكی توێژەرەوەدا دێت ئەوەیە: باشە بێ ئەملاولا كردن دەبێ ئەو لادانە فیكری و كرداریانە چی بن لە بابەت پەروەردگارێتیەوە كە قورئانی پیرۆز ئەمانەی لە ریزی گومڕایان هەژمارد كردون؟ وەڵامی كورتی ئەو پرسیارە هەر لە قورئاندا هەیە لەو ئایەتە پیرۆزەدا:

- ﴿قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ لَا تَغْلُوا۟ فِى دِينِكُمْ غَيْرَ ٱلْحَقِّ وَلَا تَتَّبِعُوٓا۟ أَهْوَآءَ قَوْمٍ قَدْ ضَلُّوا۟ مِن قَبْلُ وَأَضَلُّوا۟ كَثِيرًا وَضَلُّوا۟ عَن سَوَآءِ ٱلسَّبِيلِ﴾ المائــــدة/٧٧

واتە: ئەی موحەممەد! بە جولەكەو دیانەكان بڵێ كە خاوەنی كتێبی خودایین: لە دینەكەتاندا بە ناڕەوا زیادەڕەوی مەكەن و شوێن هەواو ئارەزوی كەسانێك مەكەون كە پێشتر گومڕا بون و خەڵكی زۆریشیان لەگەڵ خۆیاندا گومڕا كردو لە راستەڕێ دەرچون.

لەم ئایەتەدا دەردەكەوێ كە گومڕایی ئەوانەش لە بنچینەو بنەڕەتدا هەر هەمان ئەو گومڕاییەیە كە نەتەوەكانی پێشتر تێی كەوتبون. سەرباری ئەمەش گومڕاییەكی ترە كە زیادەڕەوی بو لە ئاییندا.. ئێستا ئێمە دەبینین كە چۆن دوای ئەمە قورئان ئەو شێوە گشتیە رون دەكاتەوەو درێژەی پێ دەدا:

---

(١) دیان: فەلە، گاور، مەسیحی.

ـــ ﴿ وَقَالَتِ ٱلۡيَهُودُ عُزَيۡرٌ ٱبۡنُ ٱللَّهِ وَقَالَتِ ٱلنَّصَـٰرَى ٱلۡمَسِيحُ ٱبۡنُ ٱللَّهِ ﴾ التوبـة/٣٠ واتـە: جولەکـەکان گوتيـان پێغەمبـەر عـوزەير کـوڕی خودايـەو ديانەکانيش گوتيان پێغەمبەر عيسا کوڕی خودايە .[1]

- ﴿ لَقَدۡ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡمَسِيحُ ٱبۡنُ مَرۡيَمَۖ وَقَالَ ٱلۡمَسِيحُ يَـٰبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ رَبِّي وَرَبَّكُمۡ ﴾ المائدة/٧٢ واتە: بەڕاستی ئەوانەی کە گوتيـان خودا خۆی عيسا کوڕی مەريەمـە، بـەو قسـەيەيان کـافر بـون.. عيسـا فـەرموی: ئەی بەنی ئيسرائيل، تەنها خودا بپەرستن کە پەروەردگاری من و ئێوەيە.

ــ ﴿لَّقَدۡ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ ثَالِثُ ثَلَـٰثَةٖۘ وَمَا مِنۡ إِلَـٰهٍ إِلَّآ إِلَـٰهٞ وَٰحِدٞ﴾، ﴿وَإِذۡ قَالَ ٱللَّهُ يَـٰعِيسَى ٱبۡنَ مَرۡيَمَ ءَأَنتَ قُلۡتَ لِلنَّاسِ ٱتَّخِذُونِي وَأُمِّيَ إِلَـٰهَيۡنِ مِن دُونِ ٱللَّهِۖ قَالَ سُبۡحَـٰنَكَ مَا يَكُونُ لِيٓ أَنۡ أَقُولَ مَا لَيۡسَ لِي بِحَقٍّ ) المائـدة/١١٦،٧٣ واتـە : بەڕاسـتی ئەوانەی گوتيان خودای گەورە يەکێکە لە سێ خودايـەکان (مەبەسـتيان خـودای گەورەو سەيدنا عيسـاو سـەييدە مەريەمـە کـە هـەر سێکيان بـە خـوا دادەنـێن) کافر بون، هيچ خودايەك جگە لە خودای يەکتاو تاقانە نيە.. ئەو کاتەی کە لـە ڕۆژی قيامەتدا خودای پەروەردگار دەفەرموێت : ئەی عيسـای کـوڕی مەريـەم ! ئەوە تۆ بە خەڵکيت گوتوە کە من و دايکم لە جيـاتی خـودا بـە خـودا دابنـێن؟ سەيدنا عيسا سەلامی خودای لێ بێت دەفەرموێت: پاکی بۆ تۆ ئەی خودايە! بۆ من نەهاتوە ونابێ قسەی وا بکەم کە شايانی من نەبێ.

---

[1] لێرەدا دەبينين زيادەڕەويان کرد لەوەی کە لە ئاينەکەياندا هاتبو، و پێغەمبەر عوزەير و پێغەمبـەر عيسـا سـەلامی خوايـان لـێ بێـت تـەنها ئـادەمين و پێغەمبـەرن و پلـەی لـەوە بەرزتريان نيە، بەڵام ئەوان هەستان زياد لـە پێويسـت ڕێزيـان لێنـان و کردنيـان بـە کـوڕی خوا، لە کاتێکدا کە خوای گەورە هيچ کوڕو کچی نين (پاك و بێگەردی بۆی). وەرگێڕ.

- ﴿ مَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُؤْتِيَهُ ٱللَّهُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحُكْمَ وَٱلنُّبُوَّةَ ثُمَّ يَقُولَ لِلنَّاسِ كُونُوا۟ عِبَادًا لِّى مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلَٰكِن كُونُوا۟ رَبَّٰنِيِّۦنَ بِمَا كُنتُمْ تُعَلِّمُونَ ٱلْكِتَٰبَ وَبِمَا كُنتُمْ تَدْرُسُونَ ﴿٧٩﴾ وَلَا يَأْمُرَكُمْ أَن تَتَّخِذُوا۟ ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ وَٱلنَّبِيِّۦنَ أَرْبَابًا ۗ أَيَأْمُرُكُم بِٱلْكُفْرِ بَعْدَ إِذْ أَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴾آل‌عمران/٧٩-٨٠

واتە: نـاگونجێ ورێـی تـێ ناچـێ کەسـێك خـودای گـەورە کتـێبی بـۆ بنێـرێ و حوکمی بداتە دەست و پێغەمبەرایەتی پـێ ببەخشـێ، ئینجا بـە خـەڵکی بڵێت وەرن ببنە بەندەی من لە جیاتی بەندایەتی خودا! بـەڵکو پێیـان دەڵێت ببنـە خوداپەرست و بەنـدەی خـودا [١] بـەو هۆیـەی کـە کتـێبی خـودا دەخوێننـەوەو خەڵکیش فێر دەکەن، وە بۆی نیە و ناکرێ فـەرمانتان پـێ بـدات کـە فریشـتەو پێغەمبەران بکەن بـە پـەروەردگارو لـە جیـاتی خـودای گـەورە دایـاننێن، چۆن دوای ئەوەی بون بە موسڵمان فەرمانی کوفرتان پێ دەکات؟!

لـەم ئایەتانــە دەر دەکــەوێت کــە نەتــەوە خــاوەن کتێبــەکان (جولەکــەو دیانەکان) گومڕاییان لەوەدابو:

یەکەم : زیاد لە پێویست رێزیـان لـە گیانـە پیرۆزەکـان وەکـو پێغەمبـەران و پیاوچـاکان و فریشـتەکان دەگـرت کـە لەبـەر پلـەو پایـەی ئایینیـان شـایانی رێزلێگـرتن و بەگـەورەگرتنن، بـەڵام ئـەهلی ئـەم دو ئایینـە ئـەوانیان ئەوەنـدە بەرز دەکردەوە تا دەیانگەیاندنە پلەی خودای متی و هاوەڵی خوداو بەشـدار لـە هەڵسوڕاندنی ئەم بونەوەرە!! ئینجا لەمەوە بۆ هانا بـۆ بردنیـان و پەرستنیان! چونکە وا حاڵی بوبون کە ئەم بەرێزانە لەو دیـوی سروشـتەوە لـە پـاڵ خـودای گـەورەدا بەشـێکیان لــە دەســەڵاتی خودایــەتی (الوهیــە) و پەروەردگاریــەتی

---

([١]) ئیبن عەباس لە تەفسیری وشەی (ربانی)دا دەفەرموێ : مانـای (حکمـاء، علمـاء، حلمـاء) واتە : حەکیم و زاناو سینەفراوانەکان.

(ربوبیــە) دا هەیــە.. وایــان دەزانــی كــە ئــەوانیش دەتــوانن لێیــان خــۆش بــن و پارمەتیان بدەن و بیانپارێزن.

دووەم: ﴿ ٱتَّخَذُوٓاْ أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَٰنَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ ﴾ التوبـــــة/٣١.
واتە : جولەكەو دیانەكان حیبرو راهیبەكانی خۆیان (پیاوانی دینی خۆیــان)یــان لەبری خودا دانابو، كردبویانن بــە خــودای پــەروەردگاریان، بــەوەی كردبویاننــە قسەڕۆیشتو.. بە واتایــەكی دی ئەوانــەی كــە لــە ئایینــدا هــیچ ئــەركێكیان نــەبو تــەنها ئــەوە نــەبێ یاســاكانی خــودا فێــری خــەڵكی بكــەن و پاكیــان كەنــەوە بەگوێرەی رەزامەندی خودا، ئەوانەیان بــەرز كــردەوە بەرەبــەرە تــا گەیاندیانــە رادەیەك چی ویستبایان بۆیان حەڵاڵ دەكردن و بەئارەزوی خۆشیان شتیان لــێ قەدەغە دەكردن و فەرمانیان پێ دەكردن و بەرهەڵستییان دەكردن بــێ ئــەوەی بەڵگەیەكیان لە كتێبی خــوادا هــەبێت! هــەر ئەوانــەش بەرنامــەو رێبــازو داب و نەریتیان بۆ دیاری دەكردن.

بەم شێوەیە ئەوانە كەوتنە ناو ئەو دو جۆرە گومڕاییــەی كــە پــێش ئــەوان نەتەوەی سەیدان نوح و ئیبراهیم و عاد و سەمود و خەڵكی مەدیــەن و ئــەوانی دی تێــی كــەوتبون كــە فریشــتەو پیاوچاكانیان كردبــوە هــاوەڵی خــودا یــان لــەو لایەنــەوە كــە لــە ســیفەتی پەروەردگارێتیــدا لــەو دیــوی سروشــتەوە بــە زاڵ و دەستڕۆیشــتویان دادەنــان، یــان لــەو لایــەنی سیاســیی و كۆمەڵایەتیــەوە بــە پــەروەردگاریان دادەنــان .. ئــاوا هــەمو بنــەماكانی (مبــادئ) سیاســی و یاســایی شارســـتانی و كۆمەڵایـــەتی و رەوشـــت و داب و نـــەریتییان لـــەو مرۆڤانـــەوە وەردەگرت بێ گوێدانە ئەوەی داخوا خودای گەورە رێی پێداوە یان نا؟ یان ئایــا بڕیارو یاساو رێساكانیان لەگەڵ وەحی خودای گەورەدا یەك دەگرنەوە یان نــا؟! تا گومڕاییان گەیشتە رادەیەك قورئان دەربارەیان دەفەرموێت:

- ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ نَصِيبًا مِّنَ ٱلْكِتَـٰبِ يُؤْمِنُونَ بِٱلْجِبْتِ وَٱلطَّـٰغُوتِ﴾ النساء/٥١ واتە : ئایا نابینی ئەوانەی بەشێكیان لە كتێبی خودا (تەورات) پێدرابو، باوەڕ بە جیبت ( بت و جادوگەریی) و تاغوت (حاكمی یاسا) دەهێنن؟

ـــــ ﴿قُلْ هَلْ أُنَبِّئُكُم بِشَرٍّ مِّن ذَٰلِكَ مَثُوبَةً عِندَ ٱللَّهِ ۚ مَن لَّعَنَهُ ٱللَّهُ وَغَضِبَ عَلَيْهِ وَجَعَلَ مِنْهُمُ ٱلْقِرَدَةَ وَٱلْخَنَازِيرَ وَعَبَدَ ٱلطَّـٰغُوتَ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ شَرٌّ مَّكَانًا وَأَضَلُّ عَن سَوَآءِ ٱلسَّبِيلِ﴾ المائدة ٦٠ واتە: بڵێ : هەواڵی ئەوانەتان بدەمێ كە لە لای خودای گەورە زۆر لەوە خراپترن؟! ئەوانەی خودا نەفرەتی لێ كردون و رقی لێیان هەستاوەو هەندێكیانی كردوە بە مەیمون و بەرازو هەندێكی تری كردون بە كۆیلەی تاغوتان، ئەمانە گومڕای دنیان و خراپترین جێیان لە دۆزەخدا دەبێت..

وشەی (جبت) وشەیەكی گشتگیرە بۆ هەمو شتێكی سوك وبێ ناوەرۆك بەكار دێ وەك سیحرو نوشتەو خەبەردانی غەیب و رەشبینی و گەشبینی و كاریگەری بەدەر لە یاسای سروشتی. (تاغوت)یش بریتیە لە هەر تاكێك یا چینێك یا بەڕێوەبەرایەتیەك لە رێبازی خودا دەرچوبێت و سنورەكانی بەندایەتی بەزاندبێت و داوای خودایەتی (الوهیة)و پەروەردگارێتی كردبێت..

جا كە جولەكەو دیانەكان توشی ئەو دو جۆرە گومڕاییە بون كە باسمان كرد، ویدی لە لایەكەوە هەرچی بیروبۆچونی پڕوپوچ و ئەفسانەی ئەو كاتە هەبو، خزایە ناو دڵ و مێشكیانەوە.. لە لایەكی تریشەوە لە بەندایەتی كردنی زانا و شێخ و چینی سۆفی و پیاوچاكانەوە بەرەبەرە داخزانە ناو بەندایەتی كردنی ستەمكارو سەرۆك و گەورەكانیان كە بە ئاشكرا سنوری خودایان شكاندبو و یاخی ببون.

## هاوەڵپەیداكەرانی عەرەب

كە یەكەم جار قورئانی پیرۆز لەگەڵ هاوەڵپەیداكەرە عەرەبەكانـدا دوا كـە دوا پێغەمبـەری خودایـان صـلی الله علیـە وسـلم بـۆ هـاتبو ئـەوانیش لـە چـەند جۆرێكی گومڕاییدا بون.. بزانین گومڕاییەكەیان لە چ جۆرێك بـو لـە بابـەتی (الوهیـة) و (ربوبیـة) دا. ئایـا خـودای گـەورەیان نەدەناسـی؟ یـا ئەوەتـە هـەر باوەڕیان بە بونی نەبو؟ جا بۆ ئەوە پێغەمبـەریان بـۆ نێردرابێـت تـا بـاوەڕ بـە بونی خودایان لە دڵدا بڕوێنێت، ئایا (الله) یان بـە پـەروەردگارو خـودای هـەمو جیهانیـەكان نـەدەزانی؟ جـا قورئانیـان بـۆ بنێـرێ تـا بڕوایـان بـە خودایـەتی و پەروەردگاریـەتی (اللـە) لـەلا دروسـت بكـات؟ یـا ملكەچـی خودایـان نـەدەكرد و نەیاندەپەرست ؟ یا نەیاندەزانی كە خودا بیسەری پاڕانەوەكانیانە و دەتوانێت پێداویستیەكانیان جێبەجێ بكات؟ ئایا وایان دەزانی كە (لات و عوزاو مەنات و هوبـەل)و خـودا داتاشـراوەكانی دی لـە راسـتیدا بەدیهێنـەر و خـاوەنی ئـەم گەردونەن ورۆزیدەرو كارهەڵسوڕێنەرو بەڕێوەبەرن؟ یـا بڕوایـان وابـو كـە ئـەم خودا داتاشراوانە سەرچاوەی یاسـاو چـاوگی رێنمـونی و ئامۆژگـاری كـردنن لـە كاروباری شارستانیەت و ئاكاردا؟

ئەگەر بۆ وەڵامی هەر یەك لەم پرسیارانە بگەڕێینـەوە بـۆ قورئـان ، ئـەوا وەڵامـــی هــەمویان بـــە (نـــەخێر) دەداتـــەوەو بۆمـــان رون دەكاتـــەوە كـــە هاوەڵپەیداكەرانی عەرەب نەك هەر باوەڕیـان بـە بـونی خـودای گـەورە هـەبوە، بەڵكو دەیانزانی كە (الله) بەدیهێنەر و پەروەردگارو خـاوەنی هەرمبـەرزی ئـەم بونەوەرەیە بە بتەكانیشیانەوە، وە ملكەچیشیان بۆ خودای گەورەدەكرد لەوەی كە خودایەو پەروەردگارە.. خودای گەورە ئەو زاتـە هەرمبـەرزە بـو كـە لـەكاتی تەنگانەدا پەنایان دەبردە بـەرو نكوڵیـان لـەوە نـەدەكرد بیپەرسـتن و ملكەچـی

بـن. هـەروەها دەربـارەی بـت و خواكانيـان باوەڕيـان وا نـەبو كـە بەديهێنـەری بونەوەرن، ياخود رزق و رۆزيدەری مـرۆڤن، يـا ئـەوان لـە مەيـدانی سياسـەت و ياسای بەڕێوەبەرێتی شارستانيەتدا رێنمونيكار و چاوساغيانن.. ئـەم ئايەتانـە شايەدی ئەم راستيە دەدەن :

ـــــــ ﴿ قُل لِّمَنِ ٱلْأَرْضُ وَمَن فِيهَآ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٨٤﴾ سَيَقُولُونَ لِلَّهِ ۚ قُلْ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿٨٥﴾ قُلْ مَن رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ ٱلسَّبْعِ وَرَبُّ ٱلْعَرْشِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٨٦﴾ سَيَقُولُونَ لِلَّهِ ۚ قُلْ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴿٨٧﴾ قُلْ مَنۢ بِيَدِهِۦ مَلَكُوتُ كُلِّ شَىْءٍ وَهُوَ يُجِيرُ وَلَا يُجَارُ عَلَيْهِ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٨٨﴾ سَيَقُولُونَ لِلَّهِ ۚ قُلْ فَأَنَّىٰ تُسْحَرُونَ ﴿٨٩﴾ بَلْ أَتَيْنَٰهُم بِٱلْحَقِّ وَإِنَّهُمْ لَكَٰذِبُونَ ﴾

المؤمنـون/٨٤-٩٠ واتـە : ئـەی موحەممـەد پێيـان بڵـێ: ئـەم زەويـەو كەسـانێ كـە تيايدايە هی كێيە ئەگەر دەزانن؟ لە وەڵامدا دەڵێن هی (اللـه) يـە ، بڵـێ: ئـەدی بۆ پەندو ئامۆژگاری لێ وەرناگرن؟ بڵێ : كێ بەديهێنەری ئەو حەوت ئاسمان و ئەو عەرشە گەورەيە؟ دەڵـێن : خودايـە ، بڵـێ : كەوايـە بـۆ لـە سزای ناترسـن؟ چـونكە بڕيـار دەدەن و دوايـيش بـت دەپەرسـتن! بڵـێ : كـێ خەزێنـەو مـوڵكی هەمو شـتێكی لـە دەسـتە؟و خـاوەن ئەمانـە؟ ئـەوەی مەبەسـتی بـێ پـەنای دەدا ئەگەر پەنای بۆ ببا، بەڵام كەس لەو پەنا نادرێت، ئەگەر دەزانن پێم بڵێن؟ لـە وەڵامدا دەڵێن هەر (الله)يە ئەوەی بەدەستە، پێيان بڵێ : باشە چۆن لەگەڵ دان پێدانانتان بـە يـەكتايی خـودا خۆتـان دەخەڵـەتێنن و لـە ڕێـی هـەق لادەدەن و شـتی ديكـە دەپەرسـتن؟ ئێمـە بەڵگـەی تـەواومان لـە سـەر يـەكتايی خـودا بـۆ هێنانـەوە، بـەڵام ئـەوان نەفامانـەو چەواشـەكارانە هاوەڵيـان بـۆ خـودا پەيـدا دەكرد.

ـ ﴿هُوَ ٱلَّذِى يُسَيِّرُكُمْ فِى ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ ۖ حَتَّىٰٓ إِذَا كُنتُمْ فِى ٱلْفُلْكِ وَجَرَيْنَ بِهِم بِرِيحٍ طَيِّبَةٍ وَفَرِحُوا۟ بِهَا جَآءَتْهَا رِيحٌ عَاصِفٌ وَجَآءَهُمُ ٱلْمَوْجُ مِن كُلِّ مَكَانٍ وَظَنُّوٓا۟ أَنَّهُمْ أُحِيطَ بِهِمْ ۙ دَعَوُا۟ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ لَئِنْ أَنجَيْتَنَا مِنْ هَٰذِهِۦ لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿٢٢﴾ فَلَمَّآ أَنجَىٰهُمْ إِذَا هُمْ يَبْغُونَ فِى ٱلْأَرْضِ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ﴾ **یونس/٢٢،٢٣ واتە : خودایە كە شتی بۆ وەدیهێناون تا لە وشكایی پێی بڕۆن وەكو ئەسپ و بارگیر، عەقڵی پێداون تا كەشتی بۆ ناو ئاو دروست بكەن، هەرچەندە كاتێك لە ناو كەشتیدا دەبن و بایەك دێت و دەیانبات پێی دڵخۆش دەبن ، ئەگەر لەناكاو بایەكی توند هەڵی كردو لە هەمو لایەكەوە شەپۆلی گەورەیان بۆ هات گومانیان بۆ دروست بو كە بە هیلاك دەچن، ئەوا پشت لە بتەكان دەكەن و پڕ بە دڵ هاناو هاواری خودا دەكەن! ـ ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە ئینسان لە تەنگانەدا بە فیترەوە دەگەڕێتەوە لای خودا، بۆیە پاڕانەوەی ناچار گیرایە ئەگەر كافریش بێت ـ[1] جا دەبینرێن دەڵێن: خودایە ئەگەر ئەمجارە لەم سەختی و ناهەموارییە رزگارمان كەی، ئەوا سوپاسگوزاریت دەبین و دەتپەرستین، كە خوا رزگاریان دەكات، دەبینی دیسان هاواری غەیری خودا دەكەنەوەو كردەوەی خراپ و نابەجێ دەكەنەوە.**

ـ ﴿وَإِذَا مَسَّكُمُ ٱلضُّرُّ فِى ٱلْبَحْرِ ضَلَّ مَن تَدْعُونَ إِلَّآ إِيَّاهُ ۖ فَلَمَّا نَجَّىٰكُمْ إِلَى ٱلْبَرِّ أَعْرَضْتُمْ ۚ وَكَانَ ٱلْإِنسَٰنُ كَفُورًا﴾ **الاسراء/٦٧. واتە : كاتێك لە ناو دەریادا دەبن و ترسان لە خنكان و فەوتان روتان تێ دەكات، وێڵ دەبن بە دوای فریارەسێكدا! ئەوجا دڵنیاش دەبن كە غەیری خوا كەس بە هاناتانەوە نایات، كەچی كە قورتارتان دەكات و**

---

(1) تەفسیری قورتوبی ٨/٣٢٥.

دەگەنەوە سەر وشكانی پشت لە خوا دەكەنەوەو گوێ بە وەحیەكەی نادەن.. بەڕاستی مرۆڤ كوفرانەبژێرە..

- ﴿وَٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِهِۦٓ أَوْلِيَآءَ مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَآ إِلَى ٱللَّهِ زُلْفَىٰٓ﴾ الزمر/٣ واتە: بتپەرستەكان دەڵێن : ئێمە بۆ ئەوە ئەو بتانە دەپەرستین تا پلەیەك لە خودامان نزیك بكەنەوەو بۆمان بپاڕێنەوەو داوای لێخۆشبونمان بۆ بكەن.

- ﴿وَيَقُولُونَ هَٰٓؤُلَآءِ شُفَعَٰٓؤُنَا عِندَ ٱللَّهِ﴾ یونس/١٨ واتـە : دەڵێن : ئەوانـە تكاكارمانن لەلای خودا.

هەروەها عەرەبەكانی جاهیلییـەت وا لـە بتـەكان نەدەگەیشـتن وەك ئـەوەی بڵـێن لـە كاروبـاری ژیانمانـدا ڕێنماییمـان دەكـەن، خـودای گـەورە لـە سورەتی (یونس)دا فەرمان بە پێغەمبەرەكەی دەكا كە محەممەدە ﷺ كە بفەرموێت:

ـــ ﴿قُلْ هَلْ مِن شُرَكَآئِكُم مَّن يَهْدِيٓ إِلَى ٱلْحَقِّۚ قُلِ ٱللَّهُ يَهْدِي لِلْحَقِّ﴾ یـــونس/٣٥ واتە : بە هاوەڵپەیداكەرەكان بڵێ : ئایا بتـەكان هـی وایـان تێدایـە كـە ڕێنمـایی كەس بكات بۆ ڕێی ڕاست؟

خـودای گـەورە بـەم پرسـیارە بێـدەنگی كـردن، كـەس نـەیتوانی بڵـێ بـەڵێ تیایانـدا هەیـە ڕێنیشـاندەر بـێ. وەك ئـەوەی بڵـێ (لات و عـوززاو مـەنات) و ئـەوانی تـر لـە بیروبۆچـون و ڕەفتـاردا ڕێنیشـاندەرمانن، یـاخود بنـەماكانی (مبادئ) دادگەری و ئاشتی و ئاسایشمان فێر دەكەن و ئێمـەش لـە كانیـاوی ئـەو زانسـتانەوە ڕاسـتیە سـەرەكیەكانی بونـەوەر فێـر دەبـین. لـەو كاتـەدا خـودای باڵادەست بە پێغەمبەرەكەی ﷺ دەفەرموێت :

ـ ﴿قُلِ ٱللَّهُ يَهْدِى لِلْحَقِّ أَفَمَن يَهْدِىٓ إِلَى ٱلْحَقِّ أَحَقُّ أَن يُتَّبَعَ أَمَّن لَّا يَهِدِّىٓ إِلَّآ أَن يُهْدَىٰ فَمَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ﴾ یونس/٣٥ واته: پێیان بڵێ: خودای گەورە ڕێی ڕاست نیشان دەدا، باشە ئەوەی ڕێی ڕاست نیشان دەدا شایانترە شوێنی كەوی یا ئەوەی ڕێنیشاندەر نیەو مەگەر ڕێی پێ نیشان بدرێ؟ ئەرێ ئەوە چیتانە ئەمە چۆن حوكمێكە كە خودای باڵادەست و بتەكانتان لە دەسەڵات و شوێنكەوتندا دەكەنە یەك.

دوای ئەم دەقە قورئانیانە دەمێنێتەوە داوای وەڵامی ئەو پرسیارە بكەین كە باشە دەبێ هۆی گومڕایی هاوبەشپەیداكەرانی عەرەب لە بابەت پەروەردگارێتیەوە چی بوبێت كە خودای گەورە پێغەمبەری خۆی بۆ ناردن تا بەرەو ڕێی ڕاستیان بهێنێتەوە؟ بۆچی ئەم كتێبە ڕاستەی بۆ ناردن تا لە تاریكیەوە بەرەو ڕوناكییان بهێنێتەوە؟

ئەگەر بە قوڵی لە قورئان ورد بینەوە ئەوا لە كردەوەو بیروبۆچونیاندا دەگەینە دو جۆر گومڕایی كە لە دێر زەمانەوە لە ناو نەتەوە نەفامەكاندا هەبوە.

ئەوان لەلایەكەوە لە بابەت پەروەردگارێتی و خودایەتی بە سەر ئەو دیوی سروشتدا چەند بت و خوداوەندێكیان كردبوە هاوەڵی خوداو وایان دەزانی كە فریشتەو پیاوچاكان و ئەستێرەكان لە هەندێك لایەنەوە بێ بەكارهێنانی یاسای هۆكاری (نظام العلل والأسباب) دەسەڵاتیان لەم بونەوەرەدا هەیە، لەبەر ئەوە لە پاڕانەوەو دروشمە پەرستنەكان و پشت پێبەستاندا نەدەگەڕانەوە بە تەنها بۆ لای خودا، بەڵكو بۆ خودا داتاشراوە هەڵبەسراوەكانیشیان دەگەڕانەوە.

لەلایەكی ترەوە لە بابەت پەروەردگاریەتی لە مەیدانی سیاسەت و یاساو

ڕێسای شارستانیەتدا بیریان بۆ ئەوە نەدەچو كە هەر خودای بالآدەست پەروەردگارەو بەس، بەڵكو پێشەوا ئایینی و سەرەك خێڵ و گەورەكانیان لەو ڕووەوە كردبو بە پەروەردگارو لەوانەوە بەرنامەو یاسای ژیانیان وەردەگرت.

جا لە بارەی گومڕایی یەكەمیانەوە قورئانی پیرۆز بەم ئایەتانەی خوارەوە شاهێدی دا:

ـ ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَعۡبُدُ ٱللَّهَ عَلَىٰ حَرۡفٖۖ فَإِنۡ أَصَابَهُۥ خَيۡرٌ ٱطۡمَأَنَّ بِهِۦۖ وَإِنۡ أَصَابَتۡهُ فِتۡنَةٌ ٱنقَلَبَ عَلَىٰ وَجۡهِهِۦ خَسِرَ ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةَۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡخُسۡرَانُ ٱلۡمُبِينُ ﴿١١﴾ يَدۡعُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَضُرُّهُۥ وَمَا لَا يَنفَعُهُۥۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلضَّلَٰلُ ٱلۡبَعِيدُ ﴿١٢﴾ يَدۡعُواْ لَمَن ضَرُّهُۥٓ أَقۡرَبُ مِن نَّفۡعِهِۦۚ لَبِئۡسَ ٱلۡمَوۡلَىٰ وَلَبِئۡسَ ٱلۡعَشِيرُ ﴾ الحج/١١-١٣ واتە : هەندێك كەس هەن لە لای لابەلاوە خودا دەپەرستن ! (لە كەنارێكەوە خودا دەپەرستن و نەهاتونەتە ناو دینەكەیەوە،[1] وەكو بڵێی گومانیان لە دڵدا ماوەو لە ناخیاندا جارێ قەناعەتیان پێی نەكردوە)، ئەگەر خێروبێرێكی پێبگات، ئەوا لەسەر خواپەرستی بەردەوام دەبێت، ئەگەر توشی تاقیكردنەوەو ناخۆشییەك ببێت ئەوا لە دین وەردەگەڕێ خەسارەتمەندی دونیاو قیامەت دەبێ، ئەمەیە خەسارەتی ئاشكرا. لە شتێك دەپاڕێنەوە كە نە قازانج دەگەیەنێ و نە زیان، ئەمەش ئەوپەڕی گومڕاییە، داوا لە شتێك دەكات كە زیانی نزیكترە لە قازانج! بەوەی لە دنیادا توشی سەرشۆڕیان دەكات و ئەوەی دەشیانەوێ لە قیامەت بۆیان بپاڕێتەوە بەدەستیان نایەت. ئەمانە خراپترین پشتیوان و هاودەمن .

---

([1]) واتە بە دودڵی و گومانەوە خوا دەپەرستن ، ئەمەش نمونەیەكە خوای گەورە دەیهێنێیەوە بۆ ئەو كەسانەی كە بە دڵنیاییەوە بەندایەتی خوا ناكەن ، بەڵكو بەراڕایی و گومان و دڵەڕاوكێوە خواپەرستی دەكەن وەكو دوڕو (منافق) .. (ئە.و)

- ﴿ وَيَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَضُرُّهُمْ وَلَا يَنفَعُهُمْ وَيَقُولُونَ هَٰٓؤُلَآءِ شُفَعَٰٓؤُنَا عِندَ ٱللَّهِۚ قُلْ أَتُنَبِّـُٔونَ ٱللَّهَ بِمَا لَا يَعْلَمُ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِى ٱلْأَرْضِۚ سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴾ **يونس/١٨ واته : جگە لە خودا شتانێك دەپەرستن كە نەزیانیان پێدەگەیەنن و نە قازانج و دەڵێن : ئەوانە تكاكارمانن لای خودای گەورە تا لە تاوانمان خۆش بێت.. بڵێ باشە هاوەڵێك بە خودا دەناسێنن كە خودای گەورە نە لە ئاسمانەكان و نە لە زەویدا نایناسێت و نازانێت لە كوێیە؟! پاكی و بێگەردی بۆ خودا، حودا لەم شتە پڕوپوچانەوە دورە.**

- ﴿قُلْ أَئِنَّكُمْ لَتَكْفُرُونَ بِٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْأَرْضَ فِى يَوْمَيْنِ وَتَجْعَلُونَ لَهُۥٓ أَندَادًا ﴾ **فصلت/٩ واته: بڵێ ئایا ئێوە باوەڕ بەو كردگارە ناهێنن كە زەوی لە ماوەی دو رۆژدا بەدیهێناوە؟! چۆن هاوشانی بۆ دادەنێن؟**

- ﴿ قُلْ أَتَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَمْلِكُ لَكُمْ ضَرًّا وَلَا نَفْعًاۚ وَٱللَّهُ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴾ **المائدة/٧٦ واته : بڵێ : ئایا لە غەیری خودا شتێك دەپەرستن كە توانای خێر پێدان و زەرەر لێدانی بۆتان نیەو رو لەو خودایە وەردەگێڕن كە گوێی لە قسەكانتانەو ئاگای لە حاڵ و كاروبارتانە؟!**

- ﴿وَإِذَا مَسَّ ٱلْإِنسَٰنَ ضُرٌّ دَعَا رَبَّهُۥ مُنِيبًا إِلَيْهِ ثُمَّ إِذَا خَوَّلَهُۥ نِعْمَةً مِّنْهُ نَسِىَ مَا كَانَ يَدْعُوٓا۟ إِلَيْهِ مِن قَبْلُ وَجَعَلَ لِلَّهِ أَندَادًا[1] لِّيُضِلَّ عَن سَبِيلِهِۦ ﴾ **الزمر/٨ واته : كە مرۆڤ توشی بەڵاو موسیبەتێك دەبێت یەكسەر هاناو هاوار بۆ خودای پەروەردگاری**

---

**(1) واتە: دەڵێ : فلانە شێخ و مشایەخ ئەو بەڵایەی لەسەر لابردم ، یان ئەو بەخششەم بە هۆی فلان وەلی وەرگرت.**

دەبات کە خودای ە وا گەڕامەوەو پەشیمانم، خودای ە بێ بە هاوارمەوە.. کەچی کە دەچێت بە هانایەوەو نیعمەتی خۆی پێ دەبەخشێت، لە جیاتی شوکرانەبژێریی ئەوەش فەرامۆش دەکات کە پێشتر هەر ئەم بو هانای هەر بۆ ئەو خودای ە بە دەسەڵاتە دەبرد!! سەرباری ئەم سپڵەیی و بێ وەفاییەش دەیبینیت هاوەڵی بۆ خودای پەروەردگار داناوە!!! دەبینیت بەرنامەو ڕێبازێکی تری غەیری وەحی خودای ی گرتۆتەبەر تا خەڵکی توشی گومڕایی بکات !!

- ﴿ وَمَا بِكُم مِّن نِّعْمَةٍ فَمِنَ ٱللَّهِ ۖ ثُمَّ إِذَا مَسَّكُمُ ٱلضُّرُّ فَإِلَيْهِ تَجْـَٔرُونَ ﴿٥٣﴾ ثُمَّ إِذَا كَشَفَ ٱلضُّرَّ عَنكُمْ إِذَا فَرِيقٌ مِّنكُم بِرَبِّهِمْ يُشْرِكُونَ ﴿٥٤﴾ لِيَكْفُرُوا۟ بِمَآ ءَاتَيْنَٰهُمْ ۚ فَتَمَتَّعُوا۟ فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ ﴿٥٥﴾ وَيَجْعَلُونَ لِمَا لَا يَعْلَمُونَ نَصِيبًا مِّمَّا رَزَقْنَٰهُمْ ۗ تَٱللَّهِ لَتُسْـَٔلُنَّ عَمَّا كُنتُمْ تَفْتَرُونَ ﴾ النحل/٥٣-٥٦ واتە : هەر نازو نیعمەتێکتان هەبێ هەر لە خوداوەیە، کاتێ توشی ناخۆشی دێن هاوار وەبەر ئەو دەبەن، کە ناخۆشیەکەی لەسەر لابردن ئەوا کۆمەڵێکتان لێی هەڵدەگەڕێنەوەو دەڵێن : فلانە شێخ و پیاوچاك یا فلانە بت بو ئەو ناخۆشیەی لەسەر لادابن و ئەو نیعمەتەش لەو بتانەوە چاوەڕێ دەکەن! ئەگەر وا بکەن لە ڕۆژی دواییدا دەزانن خودا چیتان بەسەر دێنێ؟ ڕۆژی ئێمە پێمان داون کەچی لە پێناوی ئەو بتانەدا دەیبەخشن و پشکی بتەکانیانی لێ دەردەکەن!! سوێند بەخودا لە ڕۆژی دواییدا لە وردو درشتی ئەو چەواشەکاریی و درۆو دەلەسەیەیان دەپرسرێتەوە ..

بەڵام سەبارەت بە جۆری دوەم لە گومڕاییان، ئەوا قورئانی پیرۆز بەم شێوە شایەتی و گەواهی دەدات:

- ﴿ وَكَذَٰلِكَ زَيَّنَ لِكَثِيرٍ مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ قَتْلَ أَوْلَٰدِهِمْ شُرَكَآؤُهُمْ لِيُرْدُوهُمْ وَلِيَلْبِسُوا۟ عَلَيْهِمْ دِينَهُمْ ﴾ الانعام/١٣٧. واتە : هەروا

گەورەپیاو سەرەك خێڵانی عەرەب[1] زیندەبەچاڵ كردنی كچەكانیان لای خەڵكی پەسەند كردبو، یا وایان فێركردبون كە كوڕەكانیان بكەنە دیاری بۆ بتەكان، ئەوەش بوە هۆی ئەوەی بەهیلاكیان ببەن و دینی پێغەمبەر (ئیبراهیم و ئیسماعیل)یان لێ تێكەڵ كەن و دەستكاری بكەن.

ئەوەی لەم ئایەتە بەدیار دەكەوێ ئەوەیە كە مەبەست لە وشەی (شركاو) بت و سەنەمەكان نیە، بەڵكو مەبەست ئەو سەرۆك و گەورە پیاوانەیە كە كوشتنی منداڵەكانیان لە پێش چاوی عەرەبەكان جوان كردبو، ئەو كردەوە پوچەیان تێكەڵ بە دینی پێغەمبەر (ئیبراهیم و ئیسماعیل سەلامی خودایان لێ بێت) كردبو، هەروەها وا تێ دەگەیشتن كە ئەو پیاوە دەسەلاتدارانە دەسەلاتیان بەسەر سیستمی ئەم بونەوەرەدا هەیە یا بیانپەرستن و لێیان بپاڕێنەوە، بەڵكو ئەو دەسەلاتدارانەیان كردبوە هاوەڵی خودا لەوەی دانیان بەوەدا هێنابو كە شایانی ئەوەن بە ئارەزوی خۆیان بەرنامەی ژیان و یاسای شارستانیەت و كۆمەڵیەتی و رەوشت و ئایین دابنێن.

ـ ﴿ أَمۡ لَهُمۡ شُرَكَـٰٓؤُاْ شَرَعُواْ لَهُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا لَمۡ يَأۡذَنۢ بِهِ ٱللَّهُ ﴾ الشـوری/٢١
واتە : یان ئەوەتا چەند هاوبەشێكیان هەیە مافی یاساو رێسا دارشتنیان داونەتێ تا رێبازی ژینیان بۆ دابنێن و تاوانیان لەبەرچاو جوان كەن، كە خودای گەورە رێی پێ نەداوە، ئەوەش بۆ ئەوەیە تا لەسەر رێبازی خودا نەڕۆن.

لە جێگەی تایبەتی خۆی لەم كتێبەدا بە درێژی باسی وشەی (دین) دەكەین ، ئینجا بەدیار دەكەوێ كە ئەم ئایەتە ماناكەی چەند فراوانە.

---

(١) خاوەنی تەفسیری (صفوة) دەفەرموێ : (شركاء) بەمانای (شیاطین)ە ، بەلام مامۆستا مەودودی بە ریش سپی و سەرەك خێڵی لێكداوەتەوە، كە ئەوەش لەگەڵ (سیاق)ی ئایەتەكە زیاتر دێت ، بۆیە ئێمەش ئەوەمان هەڵبژارد والله اعلم. وەرگێڕ

ئەوەی لێرەدا بەدیار دەکەوێ ئەوەیە کە سەرۆك و گەورەپیاوان بەرنامەو یاساو دەستوریان وەکو دینێك دادەناو بێ ئەوەی خودا رێی پێدابێ، و عەرەبی ئەو سەردەمە جاهیلییەش وا حاڵی ببون کە پێویستە شوێنیان بکەون و لەسەری برۆن. ئەم یاسادانان و شوێنکەوتنە خۆی هاوەڵپەیداکردنێکی رون وروتی خودایەتی و پەروەردگاریەتی (اللە)یەو و باوەڕهێنانیشە بە شیاوێتی ئەم هاوەڵ پەیداکردنە .[1]

## بانگەوازی قورئان دەربارەی پەروەردگاریەتی خودای گەورە

مەبەست لەم لێکۆڵینەوەیەی لەم چەند لاپەڕەیەی پێشودا نوقمی دەریاکەی بوین دەربارەی بیروڕاو دیدو بۆچونی نەتەوە گومڕاکان ئەوەیە کە پەردە لە روی راستیەك لادەین ئەویش ئەمەیە: ئەو نەتەوانەی کە قورئان مۆری گومڕایی و سەرلێشێواوی و ئاشوبگێڕی و زاڵمی لێدابون، هەر لەکۆنەوە تا کاتی هاتنە خوارەوەی قورئان، نەتەوەیەکیان تێدا نەبو باوەڕی نەبێ بە هەبونی خودای گەورە، هەروەها ملەجەڕەی ئەوەیان نەدەکرد لەوەی کە خودای گەورە

---

(١) شەهید سەید قوتب دەفەرموێ : لادانی عەرەبی سەردەمی جاهیلی لە رێگەی یەکتاپەرستی لەبوارێکی تریشدا غەیری بواری بیروباوەڕ دەردەکەوێ ، کە ئەویش بریتییە لە بواری یاساو رێسا دارشتن و ئاراستەی دەسەڵات و فەرمانڕەوایەتی ، کە ئیسلام بە سیمای یەکتاپەرستی و نیشانەی ئیسلامی دەزانێ. ئەوان حوکمیان بە داب و نەریتی جاهیلیەت دەکرد کە لە فتواو بڕیاری فاڵچیەکان و سەرەك خێڵەکان و هاوەڵ پەیداکەرە گەورەکان و پاشماوەی باوباپیرانیان پێك هاتبو.
ئەوەی جێی سەرسوڕمانیش بو ئەوەبو کە ئەمانەیان بە (شەریعەتی خوا !) و دینی ئیبراهیم دەزانی، ئایینی ئیسلامیش بۆ ئەوە هات کارەکە هەموی بۆ دەسەڵات و شەرعی خوا بگێڕێتەوە، ئەمەش بکات بە ماناو کرۆکی واقیعی و عەمەلی (لا الە الا اللە).. بڕوانە (مقومات التصور الإسلامي/ل١٠٩).. (ئە.و)

پەورەردگارە، بەڵکو گومڕایی بنەڕەتی هاوبەش لە نێوان هەموویاندا ئەوەبو کە ماناى (رب)یان کردبوە دو بەشی جیا لەیەك کە لە سەرەتای ئەم بابەتەوە بە بەلگەی زمانەوانی و قورئانی رونمان کردەوەو سەلماندمان کە لە دو لایەنەوە تێگەیشتنی هەڵە دروست بوبو :

**یەکـــەم** : ئـەو مانایانـەی کـە وشـەی (رب) دەیانگەیـەنێت لـە هەڵسان بـە پـــــەروەردەکردنی بـــــەدیهێنراوەکان و ئاگالێبونیـــــان و ئامادەکردنیـــــان و جێبەجێکردنی پێداویستیەکانیان و پاراستنیان بە رێگایـەکی بـەدەر لـە یاسای سروشـتی کـە هـەمویان خـودای گـەورە جێبـەجێیان دەکـات، ئەمـە لای ئـەوان مانایـەکی دی هـەبو، ئـەوان هەرچـەندە تـەنها (اللـە) یـان بـە پـەروەردگاری هەرەبەرزیان دادەنا، بەلام لەگەڵ خودای گەورەدا باوەڕیـان وابـو کـە فریشتەو پـەری (جـن) و هێـزە نادیارەکـان و ئەسـتێرە گەڕۆکـەکان و پێغەمبـەران و پیاوچاکان و پێشەوا ئایینیـەکانیش بەشێکیان لـەو پەروەردگارێتیـەدا هەیـەو هاوەڵ و یارمەتیدەرو هاوبەشی خودان.

**دوەم** : ئەو مانایەی کە وشەی (رب) دەیگەیەنێ لـە لایـەنی فـەرمانکردن و رێ لە خراپە گرتن و دەسەلاتداری و سـەروەریی هەرەبـەرزو سەرچاوەی رێنمایی و مەرجەعییـەتی هـەمو یاســاو دەســتورێك و حــاکمی دەوڵــەت و جەمســەری لێخڕبونەوەی شارستانێتی و کۆمەلایەتی، ئەوا لای ئەوان مانایەکی دی هەبو، جا بە پێی ئـەم بۆچـونە ئـەوان یـا ئەوەتـە باوەڕیـان وا بـو کـە کەسـایەتی مـرۆڤ بـە تـەنها پـەروەردگارن جگـە لـە خـودا ، یـا ئەوەتـە ژێربـاری پـەروەردگارێتی ئـەو کەسایەتیانە دەبون لە بواری رەوشت و شارستانێتی و سیاسەتدا ، لـە پـاڵ ئـەوەی بـاوەڕێکی نـەزەری بێکردەوەیـان هـەبو کـە (اللـە) پـەروەردگارە.. ئەمـەش ئـەو گومڕاییە بو کە پێغەمبەران سـەلامی خودایـان لـێ بێـت دەنێـردران تـا لایبـەرن. بانگـەوازی هـەمویان بـۆ ئـەوە بـو کـە وشـەی (رب) بـە هـەمو ماناکانیـەوە

لێکدەنـەوەو بیبسـەلمێننەوە کـە هـیـچ بەشـێك لـە ماناکـانی ناگەڕێتـەوە بـۆ هـیـچ کەس و لایەنێك، سیستمی ئەم بونەوەرە بـە تونـدی بەنـدە بـە بنچینەو کرۆکـی ئـەو زاراوەوە کـە خـودای گـەورە دایهێنـاوەو هـەر ئـەویش بـەڕێوەی دەبـاو هـەمو دەسەلات و کارهەڵسوڕانێك لە دەست خودای تاك و بێوێنەدایە.

جـا مـادام کـەس دەسـتی لـە بـەدیهێنانی ئـەم گەردونـەو سیسـتمیدا نیـە و هاوبەشـی لـە بـەڕێوەبردن و هەڵسـوڕاندنیدا نیـەو دەسـەلاتی خـودای گـەورە مەرکەزیە، کەواتە هەر ئەویش لە بازنەی ئەو دیوی سروشتەوە پەروەردگارتانە. پەروەردگارتانە لە مەیـدانی بەرنامـە دیـاری کـردن و ئیـدارەی سیاسـەت و یاسـاو ڕێسای شارستانیەت و پەسەندکردنی قیەم و نەریت و ڕەوشتدا، وە تەنها خـودای کردگارو پەروەردگار پەرستراوتانەو هەر دەبێ بۆ وی بچەمێنەوەو سوژدە ببـەن، هەر ئەویش گیراکاری پاڕانەوەکانتانـەو مایـەی پشت پـێ بەستنتانەو مسۆگەرو دابینکـاری پێداویسـتیتانەو هـەر ئـەو پادشـایەو خـاوەنی موڵـك و دەسـەلاتەو یاسادانەرو دەستور دارێژو فەرماندەرو ناسێنەری چاکەو خراپەیە.

ئـەو دو چـەمك و مانایـەی پـەروەردگارێتی کـە لەبـەر نـەزانیتان لێکتـان جیاکردونەتـــەوە، لـــە راســـتیدا کۆڵەکـــەو ســـتونی چـــەمکی خودایەتیـــەو تایبەتمەندی خودایەتی خودایە. لەبـەر ئـەوە نابێـت یـەکێك لـە ماناکـان لـەوی دی جیاکەینەوە یا نابێت لـە هـیـچ بەشـێك لەوانـە هاوبەشـێك بـۆ خـودا پەیـدا بکەین.

ئەو شێوازەی کە قورئان بانگەوازی لێ دەکات لەو بارەوە بەم شێوەیە:

ـــــ ﴿إِنَّ رَبَّكُمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ يُغْشِى ٱلَّيْلَ ٱلنَّهَارَ يَطْلُبُهُۥ حَثِيثًا وَٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ وَٱلنُّجُومَ مُسَخَّرَٰتٍۭ بِأَمْرِهِۦٓ ۗ أَلَا لَهُ

ٱلۡخَلۡقُ وَٱلۡأَمۡرُۗ تَبَارَكَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾ الأعـراف/٥٤. واتـە : پـەروەردگارتان ئـەو (الله)يەيە کە ئاسمانەکان و زەوی لـە شـەش رۆژدا دروسـت کـرد، ئینجا لەسـەر عـەرش جێگیربـو[1] خـودای گـەورە رۆژ بـە شـەو دادەپۆشـێ، زو روناکیەکـەی دەپێچێتەوەو رۆژو مانگ وئەستێرەکان بە فەرمانی ئەو ژێربار کـراون، مەگـەر نازانن کە بەدیهێنان و فـەرمان بـە دەسـت ئـەوەو بـەس، گەورەیی و پیرۆزی و خێروبێری زیاد بێ پەروەردگاری جیهانەکان .

(اسـتوی) دەبێـت وا لێـك بدرێتـەوە کـە شـایانی خـودای گـەورە بێـت، بـێ چوانـدن (تشبیە)و بێ لەکارخستن (تعطیل) و بـێ بەرجەسـتەکردن (تمثیـل) و بێ لادان لە بنچینەی سیفەتەکە (تحریف). وەك ئیمام مالك رەحمـەتی خـودای لـێ بێـت دەربـارەی ئـەم (اسـتوی)یـە فەرمویـەتی: (الإسـتواءُ معلـومُ ، والكيـفُ مجهولُ، والسؤالُ عنهُ بدعةٌ ، والايمـانُ بـه واجـبُ) واتـە: مانـای وشـەی (اسـتوی) دیارە، چۆنیەتیەکەی نازانرێ، پرسیار لێکردنی بیدعیەیـە، و بـاوەڕ هێنـان بـە سیفەتی ئیستیواکە فەرزە..

ـــ ﴿ قُلۡ مَن يَرۡزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِ أَمَّن يَمۡلِكُ ٱلسَّمۡعَ وَٱلۡأَبۡصَٰرَ وَمَن يُخۡرِجُ ٱلۡحَيَّ مِنَ ٱلۡمَيِّتِ وَيُخۡرِجُ ٱلۡمَيِّتَ مِنَ ٱلۡحَيِّ وَمَن يُدَبِّرُ ٱلۡأَمۡرَۚ فَسَيَقُولُونَ ٱللَّهُۚ فَقُلۡ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴿٣١﴾ فَذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمُ ٱلۡحَقُّۖ فَمَاذَا بَعۡدَ ٱلۡحَقِّ إِلَّا ٱلضَّلَٰلُۖ فَأَنَّىٰ تُصۡرَفُونَ ﴾ یونس/٣١-٣٢ واتـە: بڵێ : کێ لە ئاسمان و زەویەوە رۆزیتان دەدات؟! کێ خاوەنی چاو و گوێچکەیە؟

---

(١)لەنێو زانایاندا مشتومڕی زۆر لەسەر مانای (استوی) هەیە، نەمانویست بچینە قوڵی ئـەو باسـانە، چـونکە ئێمـەش لـەم کتێبـەدا زیـاتر مەبەسـتمان تیشـك خسـتنە سـەر ئـەو چـوار زاراوەیە، دەنـا ئـەو وشـەیەش لەسەرچاوە زانستیەکان بـەرونی باسـی لێـوە کـراوەو ئـەوەی دەیەوێ زیـاتر لێـی شـارەزابێ بـا بچـێتە خزمـەت کتێبـەکانی عەقیـدەو تەفسـیری زانایـان ، لەوێدا بە مرادی خۆی دەگا. - وەرگێڕ-

کێ شتی زیندو لە مردو بەدی دێنێ و مردو لە زیندو دەردەهێنێت؟ کێ کاروباری ئەم بونەوەرە هەڵدەسوڕێنێ و بەرەو جێ مەبەستیان دەبات؟ لە وەڵامدا دەڵێن (الله) ، دەی پێیان بڵێ : ئەدی بۆ لە سزای ئەو خودایە ناترسن‌و لەوەی پشت لە بەرنامەکەی دەکەن سڵێك ناکەنەوە؟ خۆ ئەو خودا گەورەیە پەروەردگاری حەقی ئێوەیە، لە دوای هەق گومڕایی نەبێ چیدی هەیە؟ دەی سا بۆچی لە حەق و ڕاستی لادەدەن؟

ـ ﴿خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ ۖ يُكَوِّرُ ٱلَّيْلَ عَلَى ٱلنَّهَارِ وَيُكَوِّرُ ٱلنَّهَارَ عَلَى ٱلَّيْلِ ۖ وَسَخَّرَ ٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ ۖ كُلٌّ يَجْرِى لِأَجَلٍ مُّسَمًّى﴾... ﴿ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمْ لَهُ ٱلْمُلْكُ ۖ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ فَأَنَّىٰ تُصْرَفُونَ﴾ الزمر/٥، ٦. واتە: خودای گەورە ئاسمانەکان‌و زەوی بە حەق دروست کردوەو شەو بەسەر ڕۆژدا دەهێنێت و ڕۆژیش بەسەر شەودا دەهێنێت و مانگ و ڕۆژی بە جۆرێك ژێربار کردوە کە خزمەتی مرۆڤ دەکەن و هەر یەکەیان بۆ کاتێکی دیاریکراو دەڕوات کە ڕۆژی دواییە .. ئەم خودا گەورەیە پەروەردگاری ئێوەیە، هەمو شتێك لە ئاسمان و زەویدا موڵکی ئەوەو هیچ پەرستراوێك نیە جگە لەو، ئیتر چۆن ئێوە لە ڕێگەی ڕاست لادەدەن و غەیری ئەو دەپەرستن؟

ـ ﴿ٱللَّهُ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلَّيْلَ لِتَسْكُنُوا۟ فِيهِ وَٱلنَّهَارَ مُبْصِرًا﴾ ، ﴿ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمْ خَٰلِقُ كُلِّ شَىْءٍ لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ فَأَنَّىٰ تُؤْفَكُونَ﴾، ﴿ٱللَّهُ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ قَرَارًا وَٱلسَّمَآءَ بِنَآءً وَصَوَّرَكُمْ فَأَحْسَنَ صُوَرَكُمْ وَرَزَقَكُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ ۚ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمْ ۖ فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٦٤﴾ هُوَ ٱلْحَىُّ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ فَٱدْعُوهُ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ﴾ غافر/٦١،٦٢،٦٤،٦٥ واتە: (اللە) ئەو

زاتەیە كە شەوی بۆ داناون تا تێیدا بسرەوون وئارامی تێدا بگرن و بحەسێنەوە رۆژیشی بە روناكی بۆ بەدیهێناون بۆ ئەوەی كاروكاسبی تێیدا بكەن و تێیدا بێن و بچن.. ئەوە ئەو خودایەیە كە پەروەردگاری حەقی ئێوەیەو هەمو شتێكی بەدیهێناوە، هیچ پەرستراوێك نیە تەنها ئەو نەبێ، ئیتر چۆن رو لە پەرستنی ئەو بۆ پەرستنی غەیری ئەو وەردەگێڕن؟ خودا ئەو خودایەیە كە زەوی كردوە بە مەنزڵی نیشتەجێتان ئاسمانیشی بۆ كردون بە بنمیچێكی پارێزەرو ئێوەی بە شێوەیەكی جیا لە گیاندارانی تر خوڵقاندوە و بە جوانترین‌و رێكوپێكترین شێوە دروستی كردون و نەخشە و وێنەی كێشاون و رزق و رۆزی لە شتی پاك پێداون، ئەمانە ئیشی خودای پەروەردگاری ئێوەن، دەك هەر خێروبێر و گەورەیی زیاد بێت پەروەردگاری جیهانەكان. هەر ئەو زیندوەو هیچ خوداو پەرستراوێكی تر نیە بە حەق ئەو نەبێ، دە هەر بانگی ئەو بكەن و لێی بپاڕێنەوە ئاینەكەی بە دڵسۆزی و بێ ریا بگرنەبەر.

ـ ﴿ وَٱللَّهُ خَلَقَكُم مِّن تُرَابٍ ﴾، ﴿ يُولِجُ ٱلَّيْلَ فِي ٱلنَّهَارِ وَيُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِي ٱلَّيْلِ وَسَخَّرَ ٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ كُلٌّ يَجْرِي لِأَجَلٍ مُّسَمًّى ۚ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمْ لَهُ ٱلْمُلْكُ ۚ وَٱلَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِهِۦ مَا يَمْلِكُونَ مِن قِطْمِيرٍ ﴿١٣﴾ إِن تَدْعُوهُمْ لَا يَسْمَعُوا۟ دُعَآءَكُمْ وَلَوْ سَمِعُوا۟ مَا ٱسْتَجَابُوا۟ لَكُمْ ۖ وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ يَكْفُرُونَ بِشِرْكِكُمْ ﴾ فاطر/١١، ١٣، ١٤. واتە خودای گەورە ئێوەی لە گڵ دروست كردوە، شەو تێهەڵكێشی رۆژ دەكات و رۆژیش تێهەڵكێشی شەو دەكاتەوە، رۆژو مانگی ژێربار كردوەو هەر یەكەیان بۆ ماوەیەكی دیاری كراو دیاری كردوە. ئەوەیە (الله) كە پەروەردگاری ئێوەیە، موڵك و دەسەڵاتی دنیا هەمو هی ئەوە، ئەوانەی لە غەیری خودا دەپاڕێنەوەو داوا دەكەن لەم دنیایەدا پشكیان بەقەد ئەو پەردە تەنكەی بەسەر ناوكە

خورماوەیەکەوەیــە نیــە،[1] ئەگــەر بانگیــان بکــەن ناتانبیســتن، و بشبیســتن وەڵامتان نادەنەوە چونکە توانایان نیە، رۆژی قیامەتیش لێتان بێبەری دەبــن و زۆریان پێ ناخۆش دەبێـت کـە ئـەوانتان کـردوە بـە هـاوەڵ و هاوشـانی خـودای خاوەن و کردگار .

ـــ ﴿ وَلَهُۥ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ كُلّٞ لَّهُۥ قَٰنِتُونَ ﴾، ﴿ ضَرَبَ لَكُم مَّثَلٗا مِّنۡ أَنفُسِكُمۡۖ هَل لَّكُم مِّن مَّا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُكُم مِّن شُرَكَآءَ فِي مَا رَزَقۡنَٰكُمۡ فَأَنتُمۡ فِيهِ سَوَآءٞ تَخَافُونَهُمۡ كَخِيفَتِكُمۡ أَنفُسَكُمۡۚ كَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلۡأٓيَٰتِ لِقَوۡمٖ يَعۡقِلُونَ ٢٨ بَلِ ٱتَّبَعَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓاْ أَهۡوَآءَهُم بِغَيۡرِ عِلۡمٖۖ ﴾، ﴿ فَأَقِمۡ وَجۡهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفٗاۚ فِطۡرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِي فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيۡهَاۚ لَا تَبۡدِيلَ لِخَلۡقِ ٱللَّهِۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلۡقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ﴾ الروم/ ٢٦،٢٨،٢٩،٣٠ واتە: هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدایە هی خودان و ئەو بەدیهێناون و بەڕێوەیان دەباو هەموشـیان ملکەچـی خودان .. خودای گەورە هەر لە خۆتانەوە نمونەیەکی بۆ هێناونـەوە؛ ئایا هـیچ کامێکتان رازیە بەوەی کە ئەو کۆیلەیەی کە هەیـەتی ببێتـە هـاوەڵ و هاوبـەش لەو ماڵەی کە هەیەتی و خوا پێی بەخشیوە وەکو یەك بن تیایا؟ ترسیشتان لـە یـەکتریی هەیـە!! مەگـەر خۆتـان لـەوان بـە بـەرزتر نـازانن؟ کـە نـەهێڵن ببنـە هاوبەشــتان و رقیشــتان لەوەیــە، دەی کەواتــە چــۆن لــە بەنــدەکانی خــودا هەڵدەبــژێرن و دەیانکەنــە هــاوەڵ بــۆ خــودا؟! ئێمــە ئــاوا نیشــانەو بەڵگــە

---

(١) واتە خاوەنی هیچ شتێك نین با بەقەد ئەو شتە بچوکەش بێت.. راڤەکارانی قورئـان دەفەرمون ئەمە نمونەیەکە بۆ شتی کەم و هیچ و بێ توانـا دەهێنرێتـەوە، بت و خواکـانی ئەوانەش لەبەر زەبونی و لاوازییـان و دەستەپاچـەییان لـە ئاست هـەر کاروبارێکا ، بۆتـە جێگەی مەسەل و نمونە پێهێنانەوە لە بچوکی و هیچ لەبارا نەبویان کە خاوەنی چ شـتێك نین، تەنانەت ئەو شتە بێ نرخەش.. (ئە.و)

دەهێنینەوە بۆ کەسانێك کە تێبفکرن و ئـەقڵ و ژیریـان بخەنـە گـەڕ، بـەڵام هەن کە بەبێ هیچ بەڵگەو زانیارییەك هیچ لەم پەندو ئامۆژگاریە وەرناگرن و بە عەقڵ بیر ناکەنەوەو بە دوا هەواو ئارەزوی خۆیان دەکەون.. تۆ بە پـاکی رو لـە دیـنی خـودا بکـەو خـۆت لـە رێبـاز و رێچکەیەکی خـواروخێچ لادە، خـودای گەورە هەر لە سەرەتاوە مرۆڤی وا دروست کردوە کە هەر لە منداڵیـەوە بـڕوای بە خودا هەبێ، ئەمەش رێسای ژیانەو رێسای خـودای یـش نـاگۆڕێ و هـەر بـەو شێوەیە دەمێنێتەوە، ئەمەیە رێگەی راست و ئایینی بـێ عـەیب و کـەموکورتی، بەڵام بەشی زۆری خەڵکی نازانن و بەنەزانی لێی دور دەکەونەوە.

- ﴿وَمَا قَدَرُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦ وَٱلْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ وَٱلسَّمَـٰوَٰتُ مَطْوِيَّـٰتٌۢ بِيَمِينِهِۦ ۚ سُبْحَـٰنَهُۥ وَتَعَـٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾ الزمر/٦٧ واتە: بەو شـێوەیەی کە پێویستەو شیاوە رێزیان لە خودا نەگرتوەو بـە گـەورەیان نـەزانیوە، لەگـەڵ ئـەوەش خـودای گـەورە ئەوەنـدە بـە دەسـەڵاتە لـە رۆژی دواییـدا زەوی بـەو گەورەییـەوە هـەموی لـە دەسـتی خودادایـەو ئاسمانـەکان بـە دەسـتی راسـتیەوە لـولن[1]، پـاکی بـۆ خـودا لـەوەی هاوەڵپەیداکـەران وەسـفی دەکـەن و هـاوەڵی بـۆ پەیدا دەکەن.

- ﴿فَلِلَّهِ ٱلْحَمْدُ رَبِّ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَرَبِّ ٱلْأَرْضِ رَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿٣٦﴾ وَلَهُ ٱلْكِبْرِيَآءُ فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ﴾ الجاثیة/٣٦-٣٧ واتە : سوپاس و ستایش بۆ ئەو خودایەیە کە پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەویەو پەروەردگاری هەمو

---

(1) ئایەتی وەسفی خوا چۆنە دەبێ وەك خۆی بخوێندرێتـەوەو تەفسیر بکـرێ بـێ گۆڕان و چواندن و پەککخستن.

جیهانیانە، و هەر ئەو خاوەن ڕێزو گەورەیی و دەسەڵاتی ناو ئاسمانەکان و زەویەو هەر ئەو زاڵ و دانایە.

- ﴿رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَيۡنَهُمَا فَٱعۡبُدۡهُ وَٱصۡطَبِرۡ لِعِبَٰدَتِهِۦۚ هَلۡ تَعۡلَمُ لَهُۥ سَمِيّٗا﴾ مریم/٦٥ واتـە : خـودای گـەورە پـەروەردگاری ئاسمانـەکان وزەویـەو ئـەوەی لـە نێوانیشیانە، جا هەر ئەو بپەرستەو ئـارامگر بـە لەسـەر پەرستنی، ئایا کـەس دەزانی و دەناسیّ لە وێنەو سیفاتی ئەودا بێت؟

ـــ ﴿وَلِلَّهِ غَيۡبُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَإِلَيۡهِ يُرۡجَعُ ٱلۡأَمۡرُ كُلُّهُۥ فَٱعۡبُدۡهُ وَتَوَكَّلۡ عَلَيۡهِ﴾ هود/١٢٣ واتە : نادیـاری ئاسمانـەکان و زەوی تـەنها خـودا دەیزانـیّ و کەسـی دی نـایزانیّ، و هـەمو شـتێك و فـەرمانێك دەگەڕێتـەوە لای ئـەو تـا داوەری بکـات، بیپەرستەو پشتی پیّ ببەستە.

- ﴿رَّبُّ ٱلۡمَشۡرِقِ وَٱلۡمَغۡرِبِ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ فَٱتَّخِذۡهُ وَكِيلٗا﴾ المزمل/٩ واتە : خودای گـەورە پــەروەردگارو کارهەڵســوڕێنەری بەدیهێنراوەکانـــەو خـــاوەنی ڕۆژهـــەڵات و ڕۆژئاوایە، هیچ خودایەکی بەراستی نیە ئـەو نـەبیّ، کەوابو بیکە بـە بریکاری خۆت و بە تەنها پشتی پیّ ببەستەو کاروبارت بدە دەست ئەو.

ـــ ﴿إِنَّ هَٰذِهِۦٓ أُمَّتُكُمۡ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ وَأَنَا۠ رَبُّكُمۡ فَٱعۡبُدُونِ ﴿٩٢﴾ وَتَقَطَّعُوٓاْ أَمۡرَهُم بَيۡنَهُمۡۖ كُلٌّ إِلَيۡنَا رَٰجِعُونَ﴾ الأنبياء/٩٢-٩٣ واتـە : ئەمـە ئوممەتەکـەی ئێوەیە، یـەك ئوممەتـەو منـیش خـودای پـەروەردگارتانم.. بـەڵام خـەڵکی دوای پێغەمبەرەکانیان لەنێوان خۆیاندا بونە چین چین و دابڕدابڕ بون هەر یەکـەی بەدوای ئایینێك کەوتن، هەموشـیان بـۆ لای ئێمـە دەگەڕێنـەوەو ئێمـەش لێیـان دەپێچینەوە.

ــ ﴿ ٱتَّبِعُوا۟ مَآ أُنزِلَ إِلَيْكُم مِّن رَّبِّكُمْ وَلَا تَتَّبِعُوا۟ مِن دُونِهِۦٓ أَوْلِيَآءَ ﴾ الـاعراف/٣
واتــە : شـوێنی ئـەو قورئانــە بکـەون کـە لەلایــەن پەروەردگارتانــەوە بۆتــان نێردراوە، دوای ڕێبازی غەیری وی مەکەون و خاوەن ڕێبازەکانیش مەکەن بە مشورگێڕو گەورەو پشتیوانی خۆتان.

ـــ ﴿قُلْ يَـٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَـٰبِ تَعَالَوْا۟ إِلَىٰ كَلِمَةٍ سَوَآءٍۭ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلَّا نَعْبُدَ إِلَّا ٱللَّهَ وَلَا نُشْرِكَ بِهِۦ شَيْـًٔا وَلَا يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضًا أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ ﴾ آل عمـــران/٦٤ واتـــە : بلێ: ئەی خـاوەن پەیامـە ئاسمانیـەکان وەرنـە سـەر وشـە راسـت و دروسـتەکەی نێوان ئێمە و ئێوە، کە بریتیە لەوەی جگـە لـە خـودا کەسـی دی نەپەرسـتین و کـەس نەکـەین بـە هاوبەشـی خـواو هەنـدێکمان خۆمـان نەکـەین بـە خـودای هەندێکی ترمان و لە جێی خـودای گـەورە یاسا بـۆ یـەکتری دانـێین و لەسـەری بـڕۆین.. وەکـو چـۆن جولەکـەو دیانـەکان گوێڕایـەڵی زاناکـانی خۆیـان کـرد لـە حەڵاڵ و حەرام کردندا.

ــ ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ ① مَلِكِ ٱلنَّاسِ ② إِلَـٰهِ ٱلنَّاسِ ﴾ النـاس/١-٣.
واتە : بلێ پەنا دەبەمە بەر پـەروەردگاری خـەڵکی، گـەورەو سـەرۆك و پادشـای خەڵکی، خودای پەرستراوی خەڵکی.

ـ ﴿فَمَن كَانَ يَرْجُوا۟ لِقَآءَ رَبِّهِۦ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَـٰلِحًا وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِۦٓ أَحَدًۢا ﴾ الكهف/١١٠ واتە : ئەو کەسەی دەیەوێت بە دیداری خودا شاد بێت و پاداشتی خودا وەرگرێ و لە سزاکەی وەدور کەوێتەوە، با کردەوەی چاك بکات و جگە لە خودا مەبەستی هیچ شتی تر نەبێ، نەبادا ئەو شتە ببێتە هاوەڵ پەیداکردن بۆ خودا، و خودا کردەوەی پاك و بێ گەرد نەبێ وەری ناگرێ.

بە خوێندنەوەی ئەم ئایەتانەی کە لەسەرەوە بۆ خوێنەرمان هێنانەوە بەدیار دەکەوێت کە قورئان پەروەردگارێتی بەرامبەر فەرمانڕەوایەتی و خاوەنداریێتی (Sovereignty) بەکار هێناوەو بۆمان باس دەکات کە (رب) بریتیە لە فەرمانڕەوای هەرەبەرز و رەها (مطلق)ی ئەم بونەوەرەو خاوەن و ئاراستەوانی تاك و تەنهای ئەم بونەوەرەیەو بێ هاوەڵە.

لەم دیدەوەو لەسەر ئەم بنچینەو زەمینەوەیە کە باوەڕمان وایە: تەنها خودای گەورە پەروەردگاری ئێمەو پەروەردگاری هەمو جیهانیانە، پەروەردەگارمان و جێبەجێکاری داخوازیەکانمانە. بەو شێوەیە هەر ئەو مسۆگەری مافمانەو پارێزەرو جێگەی ئومێدمانە.

وە گوێڕایەڵیکردنی خوداش بەو شێوەیە ئەو بنچینە فیترییە سروشتیە راستەیە کە بنچینەی ژیانی کۆمەڵایەتی لەسەر شێوەیەکی راست ورەزابەخش لەسەر دادەمەزرێت.. بەم ئیعتیبارەشە کە خودای گەورە شایانی ئەوەیە کە ئێمەو هەمو بەدیهێنراوەکانی دی بیپەرستین، لێبڕێین بۆی و ملکەچی بکەین، بەو ئیعتیبارەش کە ئەو خاوەنی ئێمەو هەمو شتێکەو فەرمانڕەواو دەسەڵاتدارو گەورەمانە.

لە راستیدا لە هەمو زەمانێکدا عەرەبەکان و گەلە نەفامەکان بە هەڵەدا چوبون و تا ئەمڕۆش هەر بە هەڵەدا دەڕۆن کە ئەو چەمك و مانا گەورەو گشتیەی (ربوبیە) دابەش دەکەن بۆ پێنج بەش ، ئینجا بە خەیاڵی خۆیان وا تێ دەگەن ئەم پێنج مانایە هەر یەکەیان بۆ چەند زاتێك و چەند کەسێك دەگەڕێتەوە، تا گەیشتنە ئەوەی کە بێ دودڵی بڵێن بە تەواوی ئەو مانایانە بۆ چەند خودا داتاشراوێك دەگەڕێنەوە!

جا قورئان هات و بە بەڵگە بەهێزو ئیقناعییەکەیەوە سەلماندی کە هیچ

نـاگونجێ و ڕێـی تـێ ناچـێ كـە لـەم سیسـتم و یاسـا مەركەزیـەی لـە بونـەوەردا هەیە، كارێك لە كارەكانی (ربوبیە) زۆر بێ یا كەم بگەڕێتەوە دەست یەكێك لە غەیری خودا، كە دەسەڵاتی مەركەزی بونەوەری لە دەسـتدا نـەبێ، و هـەر ئـەم مەركەزیەتـە لـەم سیسـتم و ڕێكخسـتنەدا دەیسـەلمێنێ كـە هـەمو جۆرەكـانی (ربوبیە) تایبەتە بە خودای تـاك و تـەنیاو بـێ وێنـە كـە ئـەم یاسـا و سیسـتمە ناوازەیەی لەم بونەوەرەدا هێناوەتە بون و بەڕێوەی دەبات.

لەبـەر ئـەوە هـەر یـەكێ وا تـێ بگـا كـە بەشـێك لـە بەشـەكانی (ربوبیـە) دەگەڕێتەوە بۆ كەسێك جگە لە خـودا یـا بیگێڕێتـەوە بـۆی بـە هـەر شـێوەیەك بێـت و خۆیشـی لـەم بونـەوەرەدا دەژی، ئـەوا دژایـەتی ڕاسـتی دەكـات و لـە واقیعـیش لادەدات و زوڵـم و سـتەم لـە ڕاسـتی دەكـات و خـۆی دەخاتـە بـەر هۆكارەكانی خەسارەتمەندی و لەبەین چون، ئـەویش بـەهۆی ئـەو ماندوبونـەی توشی خۆی دەكا لە ڕوبەڕوبونەوەی ڕاستی و واقیعدا.

# سێیەم: پەرستن ( العبادە )

## لێكۆڵینەوەی زمانەوانی[١]

ـ (العُبـودَة والعبوديـَة والعَبْديـَة) لـە روی زمانەوانیـەوە هـەر یـەك لەمانـە بریتیە لە ملكەچی و خۆبەكەم زانین، واتە خۆ بەدەستەوەدان و تەسلیم بونی كەسێك بۆ یەكێك كە هیچ بەرگری بەرامبەر نـەنوێنێ و لـە فـەرمانی لا نـەداو لێی یاخی نەبێ تا بە ئارەزوی خۆی بەكاری بهێنێ.

لەم سۆنگەوە عەرەب بـە وشـترێكی جڵەوكێشی ئاسـانكاریان دەگـوت: (بَعيرٌ مُعَبَّد) .

ـ (طريق مُعَبَّد) رێگایەكی خۆشكراو كە خەڵك پێدا رۆیشتوە.

---

(١) ئیبن فارس لە فەرهەنگی (معجم مقاييس اللغة ٢٠٥/٥) ماددەی (عبد)دا دەڵێ : عەین و بـاو دو بنچـینەی راسـتی ئـەم وشـەیەن و دژە یـەكن، یەكـەمیان مانـای نـەرمی و ملكەچی دەگەیەنێ و دوەمیش مانای توندوتیژیە .
ئـیبن سـیدە لـە فەرهـەنگی (المخصص ٩٦/١٣)دا دەڵێ : بنچینەی (العبادة) لـە زمانەوانیـدا ملكەچی و پەرستن و خۆبەكەم زانـین و خـۆدورگرتن و زەبـونی دێـت. هەمو ملكەچیەك ملكەچـیتری لەسـەرەوە نـەبێ (واتـە ئەوپـەڕی ملكـەچ كـردن بـێ) ئـەوا عیبادەتـە، جـا گوێڕایـەڵی تێـدابێت بـۆ پەرسـتراوەكە یـان نـا، هـەمو گوێڕایەڵیـەك بـۆ خـوا لەشـێوەی ملكەچكردن و خۆبەكەم زانین بێت ئەوا پەرستنە، پەرسـتن جۆرێكە لـە ملكـەچ كـردن و شایانی هیچ كەس نیە تەنها ئـەوەی ئەوپـەڕی بەخششی گـەورەی بەخشـیبێ وەكـو ژیـان و تێگەیشـتن و بیسـتن و بیـنین. سوپاسـگوزاری و پەرسـتن تـەنها بـۆ یەكێكـە كـە بەخششی بەخشیبێ چونكە كەمترین پەرستن بەرزترە لەوەی شایانی هیچ كەس بێ، تەنها بۆ ئـەوەی كە گەورەترین بەخششی بەخشیوە كە خوای گەورەیە بۆیە پەرستن بۆ ئەو نەبێ بۆ كەسی دی نابێ.

عیبـادەت لـەم روانگـە زمانەوانیەوەیـە مانـای بەندایـەتی و گوێڕایـەڵی و بەخودا دانان و خزمەتكردن و رێلێگرتن و مەنع كردن دێت.

لـە فەرهـەنگی (لسـان العـرب٤/٢٥٩-٢٦٩) دا لـە ژێـر مـاددەی (ع ب د) بـەو شێوەیەی خوارەوە هاتوە كە بەكورتكراوەیی دەیخەینە رو :

١- (العَبْدُ) : بەندەو كۆیلـە، پێچـەوانەی (ئـازاد)ە، كـە دەڵـێن (تعبَّـد الرجـلَ) واتە كردی بە كۆیلە، یـا بەشـێوەی كۆیلـە لەگەڵیـدا جوڵایـەوە. هـەروەها (عبَّـد الرجل وأعبدَه وأعتبدَه) هەر بەو مانایانە دێن.

لە فەرمودەیەكی پێغەمبەری مەزن ﷺ هاتوە كە فەرمویەتی: مـن دوژمـنی سێ كەسم ، یـەكێ لەوانـە : (رَجُلٌ اعتَبَـدَ مُحـرَرًا) لـە ریوایـەتێكی دیـدا (أعْبَـدَ مُحَرَرًا) واتە : پیاوێك كە كەسێكی كۆیلە ئازاد بكا.

لـە قورئانیشـدا هـاتوە كـە موسـا پێغەمبـەر سـەلامی خـودای لـێ بێـت بـە فیرعەونی فەرمو: ﴿وَتِلْكَ نِعْمَةٌ تَمُنُّهَا عَلَيَّ أَنْ عَبَّدتَّ بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ﴾ واتە: منەتی ئەوەم بەسەردا دەكەیت كە بەنی ئیسـرائیل (كوڕانی یـەعقوب)ت كـردوە بـە كۆیلـەی خۆت؟

٢- (العِبـادة) : گوێڕایەڵیەكـە ملكەچـی لەگەڵـدا بـێ: (عَبَـدَ الطـاغوتَ) واتـە: گوێڕایەڵی تاغوتی كرد. (ایاك نعبد) واتە: بەو شێوەیە گوێڕایەڵیت دەكەین كە ملكەچی تێدا بێت وئەمەش تەنها بۆ جەنابت دەكەین. ( اعبدوا ربكـم ) واتـە: گوێڕایەڵی پەروەردگارتان بكەن. (وَقَومُهُمَا لَنَـا عَابِـدونَ) واتـە: نەتەوەكەی وان ملكەچی ئێمەن.

هەر كەسێ ملكەچی پاشایەك بێت و گوێڕایەڵی دەستورو فەرمانی بكا پێی دەگـوترێ (عابـد) . (ابـن الانبـاري) دەڵـێ: (فلان عابـد) واتـە: ئـەو ملكەچـی

خودایەو خۆی بەدەست فەرمانی ئەو داوە.

٣- (عبدهُ عبادةً ومعبداً ومعبدةً) واتە: پەرستی و کردی بە خودا. (التعَبُد) واتە: زەبونی و ملکەچی و پەرستن. کە دەڵێن (هو المعبُد) واتە ڕێزلێگیراو و بە گەورە سەیرکراو وەك چۆن بپەرسترێ وایە. وەك شاعیر دەڵێ :

أرى المالَ عند الباخِلين مُعبُداً

واتە : ماڵ و سامان لەلای ڕەزیل و قرچۆکان دەبینم وەکو پەرستراو سەیر دەکرێ، ئەوەندە ڕێزی هەیە و خۆشەویستە لایان.

٤- (وعَبَدَ بهِ): لەگەڵی بو لێی جودا نەبۆوە.

٥- (ما عَبَدَك عني): چی وای لێکردی نەتوانی بێی بۆ لام.

لەم لێکدانەوە زمانەوانیە کە بۆ ماددەی (عبد) کرا دەردەکەوێت کە چەمك و مانای بنەڕەتی وشەکە ئەوەیە مرۆڤ ملکەچ بێت بۆ بەرزی و گەورەیی و دەسەڵاتی یەکێك و لە ئازادی و سەربەخۆیی خۆی دابەزێت و هیچ بەرەنگاری و یاخیبون و ڕوبەڕوبونەوەیەك نیشان نەدات بەرامبەری و بەتەواوی بچێتە ژێر ڕکێفیەوە.

ئەمەیە کاکڵەی بەندەو بەندایەتی، بۆیە کابرای عەرەب کاتێ کە گوێی لە وشەی (العبد) و (العبادة) دەبو یەکەم شت کە بە مێشکیدا دەهات بیروبۆچونی بەندایەتی بو وەکو ئەوەی لە سەرەوە باس کرا.

لەبەر ئەوەی کە ئەرکی سەرەکی عەبد گوێڕایەڵیکردنی گەورەکەی و ڕاپەڕاندنی فەرمانەکانیەتی، بۆیە مانای وشەی (العبادة) بە مسۆگەری گوێڕایەڵی کردنیش دەگرێتە خۆی. جا ئەگەر بەندە تەنها بەوەندە نەوەستا کە تەنها خۆی تەسلیمی گەورەکەی بکات و ملکەچی و گوێڕایەڵیشی بێ بەڵکو

لەگەڵ ئەوەشدا دان بنێ بە پلەوپایەی بەرزی و دەسەڵاتی و بڕوای هەبێ بە پلەو پایەی و دڵی پڕ بێت لە سۆزو سوپاسكردن بەرامبەر بە چاكە و بەخششەكانی، ئەوا بە جوانترین شێوە پێیدا دەڵێ بە شێوەیەكی هونەری و جوانكارانە سوپاسی خۆی دەردەبڕێ بەرامبەر بەخششەكانی و جێبەجێكردنی دروشمەكانی بەندایەتی. هەمو ئەوانەش پێی دەگوترێت بە خودادانان و عیبادەت كردن. جا ئەم شێوە بۆچونە ناچێتە پاڵ مانای پەرستن مەگەر لەگەڵ تەسلیم بونی رواڵەتی بەندەیەك بۆ گەورەكەی و دڵیشی لەگەڵیدا ملكەچ بێت، ئەمە دەربارەی ماناكانی یەكەم و دوەم و سێیەم. بەڵام مانای چوارەم و پێنجەم كە بۆ ماددەی (ع،ب،د) باسكران، دو بۆچونی لاوەكین و لە مانای بەندایەتی(العبدیە)دا بنەڕەتیی نین، بۆیە لە بارەیانەوە قسە ناكەین.

## بەكارهێنانی وشەی ( العبادە ) لە قورئاندا

دوای چونە نێو بنج و بناوانی وشەی (العبادة) لە زمانەوانیدا ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ قورئان دەبینین كە ئەم وشەیە بە زۆری بە سێ مانای یەكەم و دوەم و سێیەم بەكار هاتوە، لە هەندێ جێگەدا بە مانای یەكەم و دوەم پێكەوە هاتوە، لە هەندێكی دی تەنها بە مانای دوەم و لە هەندێكی تردا تەنها بە مانای سێیەم بەكار هاتوە. ئەگەرچی لە هەندێك شوێندا بە هەرسێ مانا پێكەوە بەكار هاتوە.

نمونەی بەكارهێنانی وشەی (العبادە) بەمانای یەكەم و دوەم لە قورئاندا:

- ﴿ ثُمَّ أَرْسَلْنَا مُوسَىٰ وَأَخَاهُ هَٰرُونَ بِـَٔايَٰتِنَا وَسُلْطَٰنٍ مُّبِينٍ ﴿٤٥﴾ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَمَلَإِيْهِۦ فَٱسْتَكْبَرُوا۟ وَكَانُوا۟ قَوْمًا عَالِينَ ﴿٤٦﴾ فَقَالُوٓا۟ أَنُؤْمِنُ لِبَشَرَيْنِ مِثْلِنَا وَقَوْمُهُمَا لَنَا

عَٰبِدُونَ [١]﴾ المؤمنـون/ ٤٥-٤٧ واتـە : ئینجـا موسـاو هـارونی برایمـان بـە نیشانە گەورەکانەوە کە نۆ نیشانەو بەڵگەی رون و ئاشکرا بون، نـارد بـۆ لای فیرعـەون وداروودەستەکەی (لەریش سپی و پیاوماقوڵانی) بەڵام پشتیان تێکـردن وخۆیـان بە زل زانـی چونکە گـەلێکی یـاخی و سـەرکەش و فیـزاوی بـون، گوتیـان چۆن بـاوەڕ بـە دو کەسـی وەکـو خۆمـان بێـنین لـە کاتێکـدا کـە گەلەکـەیان کۆیلـەو ژێرباری ئێمەن و گوێڕایەڵمانن.

ــ ﴿وَتِلْكَ نِعْمَةٌ تَمُنُّهَا عَلَيَّ أَنْ عَبَّدتَّ بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴾[٢] الشـعراء/٢٢ واتـە : منـەتی ئەوەم بەسەردا دەکـەیت کـە چاکەت لەگـەڵ کـردوم (مەبەسـتی فیرعەونـە) لـە کاتێکدا هەمو بەنی ئیسرائیلت کردوە بە بەندەی خۆت و بەکاریان دەهێنی؟

ئیبن کثیر ڕەحمەتی لێ بێ دەفـەرموێت: مەبەسـتی سـەیدنا موسـا سـەلامی خوای لـێ بـێ ئـەوەبو کـە بـە فیرعـەون بڵـێ: ئـەو هـەمو خراپـەی لەگـەڵ ئـەم نەتەوەیەدا کردوتە ناکاتە ئـەوەی کـە چاکەت لەگـەڵ یـەك نەفـەریان کـردوەو منەتبارم بکەی.

---

(١) ئیمامی تەبەری ڕەحمەتی خوای لێ بێت لـە تەفسیرەکەیدا (١٩/١٨) دەفـەرموێت : (لنـا عابـدون) مەبەسـتی ئەوەیـە کـە گوێڕایـەڵن و ملکەچـن و فـەرمانیان جێبـەجێ دەکـەن و ژێرباریانن، و عەرەب دەڵێن: (كلُ مَن دانَ المَلِكَ عابدٌ له) واتە هەر یەکێ ژێرباری پاشایەك بێ ئەوا گوێڕایەڵی دەکاو کاروباری دەداتە دەست ئەو و تەسلیمی دەبێ.

(٢) ئیمـامی تەبـەری ڕەحمـەتی خـوای لـێ بێـت لـە تەفسـیری ئـەم ئایەتـەدا لـە (٣٣/١٩) دەفەرموێت : مەبەستی وتەی (عبدت بنی اسرائیل) واتـە کردونـت بـە بەنـدەی خۆت (ان اتخـذتهم عبیـدا لـك)، هـەروەها لـەو تەفسـیرەدا موجاهیـد ڕەحمـەتی خـوای لـێ بێـت دەفەرموێت : یانی (استعملتهم وقهرتهم) واتـە ژێربـارت کـردون و بـەکارت هێنـاون. ئیبن جـورەیج ڕەحمـەتی خـوای لـێ بێـت دەفـەرموێت: یـانی (قهـرت و غلبـت واسـتعملت بـني اسرائیل) واتە: بەنی ئیسرائیلت ژێربار و ناچار کردون و بەکارت هێناون و بەسەریاندا زاڵ بویت.

مەبەســت لــە (عبــادة) لــە هــەردو ئایەتەکــەدا بەندایــەتی و ملکەچــی و بەگوێکردنە. هەر بەو مانایەش بو کە فیرعـەون گوتی: نەتـەوەی موسـاو هـارون ملکەچمانن، ژێردەست و ژێربارمانن و بە گوێمان دەکەن، سەیدنا موساش سەلامی خودای لێ بێت فەرموی: تۆ بەنی ئیسـرائیلت ناچارو ژێربـار کـردوە بـە ئـارەزوی خۆت بەکاریان دێنی.

## مانای یەکەمی عیبادەت: بەندایەتی و گوێڕایەڵی کردن

- ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُلُواْ مِن طَيِّبَٰتِ مَا رَزَقۡنَٰكُمۡ وَٱشۡكُرُواْ لِلَّهِ إِن كُنتُمۡ إِيَّاهُ تَعۡبُدُونَ ﴾ البقرة/١٧٢ واتە: ئەی ئیمانداران، لەو شتە پاك و حەلاڵانـە بخۆن کە پێمان داون و سوپاسی خودا بکەن ئەگەر ملکەچی ئـەو دەکـەن و بـە تـەنها دەیپەرستن[١].

ئەم ئایەتە بەو بۆنەیەوە هاتە خوارەوە کە عەرەبەکان لـە پـێش ئیسلامدا جۆرەهـا مـەرج و رێ وشـوێنیان دانـابو بـۆ خـواردن و خواردنـەوە ئەمـەش بـۆ گوێڕایەڵی کردنـی پێشـەوا ئایینیـەکانیان و شـوێنکەوتنی باوباپیرانیـان ، بـەڵام کـاتێ موسـڵمان بـون خـودای گـەورە فـەرموی ئەگـەر مـن دەپەرسـتن پێویسـتە هەمو ئەو بەندو باوانە بشکێنن و هەمو شـتێك بخـۆن کـە بـۆم حـەڵاڵ کـردون،

---

(١) ئیمامی تەبەری رەحمەتی خـوای لـێ بێـت لـە تەفسـیری ﴿إِن كُنتُمۡ إِيَّاهُ تَعۡبُدُونَ﴾ لـە بەرگی(٢/٥٠) دا دەفەرموێ: ئەگەر ئێـوە پابەنـدن بـە فـەرمانی ئـەو، و گـوێگرو گوێڕایـەڵی ئەون، ئەوا هەمو شتێك کە بۆی حەڵاڵ کردون بیخۆن و واز لە بەندوباوی شەیتان بێنن لە حەرام کردنی ئەو شتانە کە خوای گەورە دەفەرموێ بیـانخۆن و هـەر ئـەو بـۆی دانـاون کـە بیانخۆن و واتـێ نەگـەن کـە حەرامـەو رێـی لێگرتـون، کـە شـتی حـەڵاڵ بـە حـەرام دابنـێن، چونکە بـە حـەرام دانـانی ئـەو شـتانە لـە کـاتی نەفامیـدا گوێڕایـەڵی کردنـی شـەیتان بـو، هەروەها شوێنکەوتنی پێشەوا کافرو باو باپیرە نەفامەکانیان بو.

واته ئەگەر ئێوە بەندەی زاناو پیاوە ئایینیەکانتان نین و خۆتان بە بەندەی گوێڕایەڵی خودا دادەنێن و ئەگەر وازتان لە گوێڕایەڵی وان هێناوەو گوێڕایەڵی خودا دەکەن ، ئەوا پێویستە لەسەرتان کە بە دوای ئەو بەندو رێ ورەسمە بکەون کە خودا بۆی داناون نەك بە دوای ئەوەی کە پێشەوا ئایینیەکانی پێش ئیسلام بۆیان داناون ، بۆیە وشەی (العبادە) لێرەشدا بە مانای بەندایەتی و ملکەچی و گوێڕایەڵیکردن هاتوە.

- ﴿قُلْ هَلْ أُنَبِّئُكُم بِشَرٍّ مِّن ذَٰلِكَ مَثُوبَةً عِندَ اللَّهِ ۚ مَن لَّعَنَهُ اللَّهُ وَغَضِبَ عَلَيْهِ وَجَعَلَ مِنْهُمُ الْقِرَدَةَ وَالْخَنَازِيرَ وَعَبَدَ الطَّاغُوتَ [1]﴾ المائدة/٦٠ واتە : بلێ : ئەو شتەی ئێوە بە عەیبی دادەنێن بۆ ئێمە کە یەکتاپەرستیە، هەواڵتان پێ بدەم کە سزایەکی خراپتر لەو عەیب گرتنەتان لای خودا چۆنە؟ ئەوەی کە خودای گەورە

---

(١) ئیمامی تەبەری رەحمەتی خوای لێ بێت لە لێکدانەوەی (تاغوت)دا پاش ئەوەی قسەی هەندێ لە توێژەرەوەی قورئان دەهێنێتەوە لە بەرگی(١٣/٣)دا دەفەرموێ : ئەوەی لای من راست بێ ئەوەیە تاغوت بریتییە لەوەی کە هەمو شتێك لە سنوری خۆی لابداو هەقی خودا بۆ خۆی زەوت بکات، و لەباتی خودا بپەرسترێ، جا چ بە ناچاری و بە زۆری بپەرستێ یا بە ئارەزوی خۆیان گوێڕایەڵی بکەن و بیپەرستن، جا ئەو پەرستراوە بنیادەم بێ یا شەیتان، یا بت بێ یا هەر شتێك، وا دەزانم بنەڕەتی وشەی تاغوت لەوەیە کە کابرای گۆتیار دەڵێ فلانەکەس تاغیە واتە لە رادەی خۆی تێپەڕی ئەو سنورەی بۆی دیاری کرابو لێی لادا.

سەیری تەفسیری مامۆستا مەودودی بۆ وشەی تاغوت بکە بەو شێوەی لە لاپەڕە (٥٣)ی ئەم کتێبەدا هاتوە، و (ابو داود الطیالیسي) لە (ابن مسعود)ەوە - خوا لێی رازی بێت - دەگێڕێتەوە دەفەرموێت لە پێغەمبەر ﷺ پرسیار کرا دەربارەی (القردة والخنازیر) کە ئایا نەوەی جولەکەن؟ فەرموی: نا، خوای گەورە نەتەوەیەکی لەعنەت نەکردومو شێوەی گۆڕیبن (مسخ) و نەوەیان هەبێ. و ئەوانەش (القردە والخنازیر) بەدیهێنراوێك بون نەماون و دوای ئەوەی خوا لە جولەکە تورە بو شێوەی گۆڕین وەکو مەیمون و بەراز.. تەفسیری ئیبن کثیر (٥٣٠/١).

نەفرەتی لێکردووەو لە بەزەیی خۆی دوری خستۆتەوە ورق و توڕەیی خۆی بەسەردا رشتوەو لەوان مەیمون و بەرازی دروست کردوە، هەروا کەسێك کە تاغوت وسەرکەشی پەرستوە.

- ﴿ وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولًا أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ ﴾ النحل/٣٦ واتە: بێگومان لە نێو هەر نەتەوەیەکدا نێردراوێکمان ناردوە کە بەتەنها خودا بپەرستن و لە تاغوت دورکەونەوە.

- ﴿وَالَّذِينَ اجْتَنَبُوا الطَّاغُوتَ أَن يَعْبُدُوهَا وَأَنَابُوا إِلَى اللَّهِ لَهُمُ الْبُشْرَىٰ فَبَشِّرْ عِبَادِ ﴾ الزمر/١٧ واتە : ئەوانەی لە پەرستنی تاغوت دورکەوتنەوە و گەڕانەوە لای خودا، مژدەی لێخۆشبون و چونە بەهەشتیان پێبدە.

لەم سێ ئایەتەدا مەبەست لە عیبادەتی تاغوت بەندایەتی و گوێڕایەڵی کردنیەتی و مانای تاغوت لە زاراوەی قورئاندا وەکو لە پێشەوە ئاماژەمان بۆ کرد هەر دەوڵەتێك یا دەسەڵاتێك یا پێشەوایەتیەك یا فەرمانڕەواییەك لە خودا یاخی بێ و هەڵگەڕێتەوەو مافی خودا زەوت لەو بارەیەوە بکا، ئینجا فەرمانی دەربکاو خەڵکی لە سەر زەوی خودا ناچار بکاو هانیان بدا لەسەر ئەو فەرمانە بڕۆن، جا چ بە ناچاری و تۆبزی لێکردن بێ یا بە فریودان یا فێرکردنی تێکدەرانە بێ [1]، تەسلیم بونی مرۆڤ بەم جۆرە دەسەڵاتەو

---

(1) بێگومان هەرچی تاغوتی سەرزەوی ورژێمەکانیان بۆ هەڵنانی ژێردەستەکانی تا لەسەر یاساکەی بڕۆن و ژێربار بن، ئەم سێ ئامڕازە بەکار دەهێنێت:

١- ناچارکردن : ئەویش بە دامەزراندنی دەزگای سەرکوتکەرو داپڵۆسێنەر بۆ چاوسورکردنەوەو تۆقاندن و گرتن و کوشتنی ئەوانەی کە لەسەر یاساکەیان ناڕۆن بەڕێوە، تا ئەوانیدی ناچار کرێن ملکەچ بن.

٢- فریودان: بە پلەو پایەو هەڵڕشتنی ماڵ بۆ هەندێك و وەعدە پێدانی بەدرۆو چاوبەست کردن و لێکدانەوەی واقیع لەسەر ناڕاستی و بەکارهێنانی ئافرەت و خەریك کردنی گەنجان و پەرەپێدانی وەرزش بەشێوەیەکی لەرادەبەدەرو شتی دی وا

ملکەچیکردنی و گوێڕایەڵی کردنی، عیبادەت کردنە بۆ ئەو تاغوتە!

## مانای دوەمی عیبادەت: بەگوێ کردن و گوێڕایەڵیکردنی ( الطاعة )

لێرەدا ئەو ئایەتانە دەهێنین کە زاراوەی عیبادەتیان تەنها بە مانای دوەم تێدا هاتوە، خودای گەورە دەفەرموێت:

ـــــ ﴿أَلَمۡ أَعۡهَدۡ إِلَيۡكُمۡ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ أَن لَّا تَعۡبُدُواْ ٱلشَّيۡطَٰنَۖ إِنَّهُۥ لَكُمۡ عَدُوّٞ مُّبِينٞ﴾ يس/٦٠ واتە ئەی بنیادەم - روەوڕوی یاخیبوانە - ئایا من لەسەر زمانی پێغەمبەران ئاگادارم نەکردنەوەو ئامۆژگاریم نەکردن کە گوێڕایەڵی شەیتان نەکەن، بەراستی شەیتان دوژمنێکی ئاشکرای ئێوەیە.

---

٣- بە فێرکردنی زانستی تێکدەرو روخێنەر: ئەویش بە دانانی رێگەی لارو وێر کە رۆڵەکانی گەل بەرەبەرەو بۆ ماوەیەکی دور لە ئاین و رەوشت و کەلەپوری خۆیان دور دەکاتەوە، ئەویش بەهێنانی ئەو بیردۆزو شێوازانەی کە هیچ وڵاتێکی بەناو پێشکەوتوی پێ رازی نیە، بۆ نمونە لە زیندەوەرزانی بیردۆزی داروینیان هێناوە کە وا لە بنیادەم دەگەیەنێ کە بنەچەکەی لە مەیمونەوە هاتوەو لە ئابوریدا دیدی مارکسیزم کە مرۆڤ وەکو کاڵایەك دەخەمڵێنێ، لە کۆمەڵناسیدا دیدی دۆرکایم و فرۆید کە وا لە خەڵك دەگەیەنن هەمو هەوڵی مرۆڤ بۆ تێرکردنی ئارەزوی جنسە یان دیدی داروین کە دەڵێ :هەق لەگەڵ هێزدایە. لە بابەتی مێژوش کتێبی ئەوانەی کە ئیسلام لەبەرچاوی خەڵك ناشیرین دەکەن و گۆڕیویانە وەك (جۆرجی زێدان) و رۆژهەڵاتناسەکان، هەروەها گرتنەبەری سیاسەتی تێکەڵکردنی کچ و کوڕ هەر لەمنداڵیەوە و فێرکردنی سرودی وا کە بۆنی هاوەڵپەیداکردنی لێ دێت و گۆشکردنیان بە بیروبۆچونی خاکپەرستی و زمان پەرستی و چینایەتی و پیرۆزگرتنی کەسایەتی و چەندان شتی تر، کە لە دوایدا دەبینین تا رادەیەك بەرێوەچونی میللەتیان بۆ ئاسان دەبێ تا پۆخڵەواتی رێبازو دەستوریان بەدیار دەکەوێ و میللەت لێیان وەخەبەر دێ دەیانخاتە کەنارەوە.. بەڵام بەداخەوە تا ئیسلامیان دەگاتێ دەکەونەوە داوی تاغوتێکی دی و هەمان تاقیکردنەوەیان لەسەر دوبارە دەکاتەوە ، ئەگەر بەخۆ نێنەوەو لەسەر یاسای خوا نەڕۆن. وەرگێڕ

دەزانین لەم دنیایەدا کەس دڵی بۆ پەرستنی شەیتان ناچێ، هەمو کەسێ لە خۆی دور دەخاتەوەو نەفرەتی لێ دەکا، بۆیە خودای گەورە لە رۆژی دواییدا کە تاوان دەداتە پاڵ بنیادەم لەسەر ئەوە نیە کە شەیتانی پەرستوە، بەڵکو لەسەر ئەوەیە کە گوێڕایەڵی کردوەو بە خێرایی بەو رێگایانەدا رۆیشتون کە شەیتان پێی نیشان داون.

ـــ ﴿ٱحۡشُرُواْ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ وَأَزۡوَٰجَهُمۡ وَمَا كَانُواْ يَعۡبُدُونَ ﴿٢٢﴾ مِن دُونِ ٱللَّهِ فَٱهۡدُوهُمۡ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلۡجَحِيمِ﴾، ﴿وَأَقۡبَلَ بَعۡضُهُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٖ يَتَسَآءَلُونَ ﴿٢٧﴾ قَالُوٓاْ إِنَّكُمۡ كُنتُمۡ تَأۡتُونَنَا عَنِ ٱلۡيَمِينِ ﴿٢٨﴾ قَالُواْ بَل لَّمۡ تَكُونُواْ مُؤۡمِنِينَ ﴿٢٩﴾ وَمَا كَانَ لَنَا عَلَيۡكُم مِّن سُلۡطَٰنِۭۖ بَلۡ كُنتُمۡ قَوۡمٗا طَٰغِينَ﴾الصـــافات/٢٢، ٢٣، ٢٧-٣٠ واتە: ستەمکاران وهاوێنەکانیان کۆکەنەوە، زیناکار لەگەڵ زیناکار، شەرابخۆر لەگەڵ شەرابخۆرو هەروەها.. لەگەڵ ئەوانەی لەباتی خودا دەیانپەرستن، رێگەی دۆزەخیان نیشان دەن چونکە رێی راستیان لە دنیادا نەگرت. ئەم شوێن کەوتوە سەرلێشێواو گومڕایانە لە رۆژی دواییدا لەگەڵ سەرۆکەکانیانو روبەڕو دەبن و لۆمەی یەکتر دەکەن، شوێنکەوتوان بە سەرۆکەکانیان دەڵێن: ئێوە هەمیشە رێگەی راستتان لێ دەگرتین و لەلایەنی راستی و خێرخوازییەوە بۆ لامان دەهاتن تا بڕواتان پێ بکەین، سەرۆکەکانیش دەڵێن: نەخێر، ئێوە خۆتان لە وەرگرتنی ئیمان دڵتان رەق بو، ئێمە هیچ دەسەڵاتێکمان بەسەر ئێوەدا نەبو خۆتان کۆمەڵێکی سەرکەش و لە رێدەرچو بون.

بە وردبونەوە لەم گفتوگۆیەی نێوان پەرستیارو پەرستراوان، دەردەکەوێت کە مەبەست لە پەرستراوەکان بت و خودا داتاشراوەکان نین کە نەتەوەکە دەیانپەرستن، بەڵکو ئەو پێشەواو چاوساغانەی خۆیان وا نیشان دەدا کە رێنماو ئامۆژگاریکەری خەڵکن لە بەرگی پیاوچاك و داوێنپاکانەوە هاتنە پێشەوەو

فریویان دابون بە تەسبیح و جوببەکانیان و قەد و قیافەی روالّەتییان [1] و وایان کردبو کە شوێنیان کەون و فیتنەو ئاژاوەیان بلاّوکردبوەوە بەناوی چاك كردن و چاکەکاری و چاکەخوازی.

جا لاساییکردنەوەو چاولێکردنەوەیەکی کوێرانەی ئەوجۆرە کەسانەو شوێنکەوتنی فەرمانەکانیان کەوتۆتە بازنەی پەرستنیانەوە.. ئەمەشە کە خودای گەورە لەم ئایەتەدا بە وشەی (عبادە) دەری بڕیوە :

- ﴿ اتَّخَذُوا أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ اللَّهِ وَالْمَسِيحَ ابْنَ مَرْيَمَ وَمَا أُمِرُوا إِلَّا لِيَعْبُدُوا إِلَٰهًا وَاحِدًا ﴾ التوبة/٣١ واتە: ئەوانە (فەلەو جولەکەکان) حیبرو راهیبەکانی خۆیان (کە پیاوی دینییان بون) لەباتی خودای گەورە کردبوە خوای خۆیان.. هەروەها سەیدنا عیسای کوڕی مەریەم!! لە کاتێکدا کە فەرمانی ئەوەیان لێ تەئکید کرابۆوە کە تەنها خوای تاك و پاك بپەرستن..

مەبەست لە بەخوداداناني زاناو پێشەوا ئایینیەکان و پەرستنیان لە لایەن خەڵکەکەوە لەم ئایەتەدا ئەوەیە کە ئەو خەڵکە بڕوایان وا بو کە ئەو زاناو پێشەوایانە خاوەنی دەسەڵاتێکن دەبێ بە گوێیان بکرێ لەوەی کە دەڵێن بیکە یا مەیکە، و ملکەچیان بن بێ ئەوەی کە خودای گەورە یا پێغەمبەر ﷺ رێیان پێدابێت، پێغەمبەری خوا ﷺ لە فەرمودە راستەکاندا ئاماژەی بۆ ئەوە کردوە، کاتێ کە پێی گوتراوە ئێمە زاناو پێشەواکانمان نەدەپەرست، پێغەمبەر ﷺ لە وەڵامدا فەرموی: مەگەر حەڵاڵی وانتان بە حەڵاڵ دانەدەنا و حەرامی وانتان

---

([1]) بێ گومان ئەوانەش دەگرێتەوە کە بە سیاسەتی دیماگۆگیانە خەڵکی لە دەوری خۆیان کۆ دەکەنەوەو بەرەو مەبەستەکانی خۆیانیان دەبەن. وەرگێر

بە حەرام دانەدەنا؟ [١]

## ماناى سێیەمى عیبادەت: بەخودا دانان ( التألُّه )

با ئێستا سەیرى ئەو ئایەتانە بکەین کە وشەى (العبادة) تیایاندا بە مانـاى سێیەم هاتوەو با ئاگادارى ئەوەش بـین کـە لێـرەدا مانـاى عیبـادەت لـە بـەخودا داناندا بە پێی ئەوەى کە لە قورئاندا هاتوە دو شت دەگرێتە خۆى:

یەکـەم : ئەوەیـە کـە مـرۆڤ هەنـدێ لـە دروشمـەکانى پەرستن بـۆ یـەکێك ئەنجام بدات. وەك سوژدەو رکوع و لە خزمەت وەستان و سوڕانەوە بە دەوریـدا (تەواف کردنى) و ماچ کردنى دەرگاو نەزر لـە خـۆگرتن و قوربـانى کـردن.. تـا هەمو ئەو شتانەى کە خەڵکانێك بەنیازى پەرستن و قوربانى کردن ئـەنجامیان دەدات، جا گرنگ نیە مرۆڤ وا بزانـێ کـە ئـەو کەسـە خودایـەکى هـەرە بـەرزەو سەربەخۆیە یا بۆ ئەوە لێی بپاڕێتەوە تا بە هۆیـەوە لـە خـودا بەرزەکـە نزیـك بێتەوە یان بیکا بە هۆو وەسیلەى تکاو شەفاعەت کردن یاخود بیکا بـە هـاوەڵی ئەو خودایـە بـەرزەو وا بزانـێ شـتێکى بەدەسـتە لـە هەڵسوڕانى کاروبـارى ئـەم دنیایەدا.

دوەم : ئەوە کە مرۆڤ وا دابنێ کە یـەکێك لـەم دنیایـەدا زاڵە بەسـەر یاسـاى هۆکارەکاندا [٢]، ئینجا لە کاتى گیروگرفت و پێویستى و ناچاریدا هاوارى وەبـەر

---

(١) ئاماژەیە بۆ ئەو فەرمودەى پێغەمبەر ﷺ کە سەیدنا عەدى کوڕى حاتەم خوا لێـی رازى بێـت دەیگێڕێتـەوە کـە پـێش موسـوڵمان بـونى چـۆن چـوە خزمـەت پێغەمبـەرى خـوا، کـە خاچێکى لەملدا بو.

(٢) مەبەسـت ئەوەیـە هـەر کارێـك هۆکـارێکى دەوێ بـۆ روودانـى ، واتـە خـواى گـەورە لـەم گەردون و بونەوەرەدا ئەم یاساو رێسایەى دانـاوە کـە بـۆ روودان و سـەرهەڵدانى هـەر کـار و روداو (حدث)ێك هۆکار(سبب)ێکى داناوە.

بەرێ و پەناى پێبداو پێى وا بێت لە تەنگانەو لێقەومان و كەمدەرامەتى و لەدەست دانى كەس وكاردا بە هانايەوە دێت..

ئەم دو شێوەيە لە كردارى مرۆڤدا هەردوكيان دەچنە ناو بازنەى ماناكانى (بەخودا دانان) بە پێى ئەم ئايەتانە :

ـــ ﴿قُلۡ إِنِّي نُهِيتُ أَنۡ أَعۡبُدَ ٱلَّذِينَ تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ لَمَّا جَآءَنِيَ ٱلۡبَيِّنَٰتُ مِن رَّبِّي﴾ غافر/٦٦ واتە: بلێ: خوداى گەورە رێى لێ گرتوم لەوەى كە ئەو دارو بەردانە بپەرستم لە باتى ئەو، لە كاتێكا موعجيزەو بەلگەى ئاشكراو رۆشنم لەلايەن پەروەردگارمەوە بۆ هاتوە كە نابێ جگە لەو بپەرسترێ.

ـ ﴿وَأَعۡتَزِلُكُمۡ وَمَا تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَأَدۡعُواْ رَبِّي﴾ ﴿فَلَمَّا ٱعۡتَزَلَهُمۡ وَمَا يَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَهَبۡنَا لَهُۥٓ إِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَ﴾ مريم/٤٨، ٤٩ واتە : جيا دەبمەوەو گۆشەگیر دەبم لێتان، لە خۆتان و لەو شتانەش كە لە جياتى خودا دەيپەرستن‌و بانگيان دەكەن و هانايان بۆ دەبەن، من بە پاكيى رو دەكەمە خوداو بێهاوەڵ دەيپەرستم.. كاتێ (سەيدنا ئيبراهيم پێغەمبەر سەلامى خوداى لێ بێت) كە لەوان و لەوانەى جگە لە خوا دەيانپەرست جيابوەوەو كۆچى بۆ شام كرد، ئيسحاقمان پێ بەخشى و دواييش يەعقوب..

ـ ﴿ وَمَنۡ أَضَلُّ مِمَّن يَدۡعُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَن لَّا يَسۡتَجِيبُ لَهُۥٓ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ وَهُمۡ عَن دُعَآئِهِمۡ غَٰفِلُونَ ۝٥ وَإِذَا حُشِرَ ٱلنَّاسُ كَانُواْ لَهُمۡ أَعۡدَآءً وَكَانُواْ بِعِبَادَتِهِمۡ كَٰفِرِينَ﴾ الاحقاف/٥-٦ واتە: كێ لەو كەسە گومڕاترە كە هانا بۆ غەيرى خوا بۆ شتانێك دەبات كە هەتا رۆژى دوايى ناتوانن بە هانايانەوە بێن! نەك هەر ئەوە بەڵكو هەر ئاگاشيان لەو هانا بۆ هێنانەى ئەوان نيەو بێ ئاگان لێى، كاتێ كە خەڵكيش لە

رۆژی دواییدا کۆدەکرێنەوە بتەکان ئەبن بە دوژمنی پەرستیارەکانیان و نکوڵی لەوە دەکەن کە ئەوانیان پەرستبێ، واتە : پێیان دەڵێن ئێمە فەرمانمان پێ نەکردون کە بمانپەرستن و هەر ئاگایشمان لێ نەبوە کە ئێمەتان پەرستوە.

لەم سێ ئایەتەدا بە ئاشکرا دەردەکەوێت کە عیبادەت بە مانای پاڕانەوەو هاوار وەبەر بردن هاتوە.

- ﴿بَلْ كَانُوا يَعْبُدُونَ الْجِنَّ أَكْثَرُهُم بِهِم مُّؤْمِنُونَ﴾ سبأ/٤١ واتە: بەڵکو هاوەڵ پەیداکەران هاواریان وەبەر جنۆکە [١] دەبردو بەندایەتی ئەوانیان دەکرد زۆربەیان باوەڕیان پێیان هەبو وایان دەزانی کە کچی خودان و دەسەڵاتیان هەیە.

مەبەست لە پەرستنی جنۆکەو باوەڕ پێ بونیان لەم ئایەتەدا ئەو ئایەتەی سورەتی (جن) باشتر رونی دەکاتەوە :

- ﴿وَأَنَّهُ كَانَ رِجَالٌ مِّنَ الْإِنسِ يَعُوذُونَ بِرِجَالٍ مِّنَ الْجِنِّ﴾ الجن/٦ واتە : هەندێك لە بنیادەمەکان (انس) پەنایان وەبەر هەندێك لە جنۆکەکان دەبرد!

دەرکەوت کە مەبەست لە پەرستنی جنۆکە هاوار لێکردن و پەنا وەبەر بردنیانە لە کاتی کەم دەرامەتی و مردن و لێمردن و بەڵاو ناخۆشیدا. هەروەها مەبەستیش لە باوەڕ پێبونیان بریتیە لە باوەڕکردن بە دەسەڵاتیان لەسەر پەنادان و بەدەمەوە چون .

---

(١) ئەو جنۆکانەی کە لەرێی خوا لایان داوە، لێرەدا مەبەست ئەوانەن کە لە قورئاندا بە (شیاطین) ناوبراون، دەنا جنۆکەش موسڵمانیان هەیە.

ـــــ ﴿ وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ وَمَا يَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ فَيَقُولُ ءَأَنتُمْ أَضْلَلْتُمْ عِبَادِى
هَٰٓؤُلَآءِ أَمْ هُمْ ضَلُّوا۟ ٱلسَّبِيلَ ﴿١٧﴾ قَالُوا۟ سُبْحَٰنَكَ مَا كَانَ يَنۢبَغِى لَنَآ أَن نَّتَّخِذَ مِن دُونِكَ
مِنْ أَوْلِيَآءَ ﴾[1] الفرقان/١٧،١٨ واته : كاتێ لەو رۆژەدا (قیامەت) ئەوانەی غەیری خودا دەپەرستن و پەرستراوەكانیشیان (وەكو عوزەیر و عیساو فریشتەكان) كۆ دەكاتەوەو خودای گەورە لە پەرستراوەكان دەپرسێ: ئایا ئێوە ئەو بەندانەی منتان گومڕا كردو پێتان گوتن بمانپەرستن یان خۆیان ڕێگەیان ون كرد؟ ئەوانیش بەسەرسوڕمانێكەوە دەڵێن: پاكی بۆ تۆ ئەی خودای گەورە! تۆ دوری لە هەمو هاوەڵێك، بۆ ئێمە ناشێ جگە لە تۆ كەس بە گەورەو مشورگێڕ و پەرستراو دابنێین.

لەم ئایەتەوە ڕۆشن دەبێتەوە كە مەبەست لە پەرستراوەكان پێغەمبەران سەلامی خودایان لێ بێت و پیاوچاكان (الاولیاء)و.. مەبەستیش لە پەرستنیان ئەوەیە كە وا بزانرێت ئەوانە لە تایبەتمەندیەكانی بەندایەتی بالاترو دەستڕۆیشتون هەندێك سیفەتی خودایەتیان هەیەو توانای ئەوەیان هەیە لە ڕێگەی غەیبەوە بە هانای خەڵكیەوە بێن و زیانیان لەسەر لابەرن، بۆیە پێیان وایە هەقە هەندێك لە دروشمە پەرستنەكانیان بۆ ئەنجام بدرێت، وەك لێپاڕانەوەو قوربانی بۆ كردن و تەواوف كردن بە دەوری نزرگەو مەرقەدەكانیاندا! هەروەها ڕێزگرتن و بە گەورەدانانیان تا دەگاتە نزیك ئەوەی ببێ بە پەرستن و ملكەچی كردن و سەر بۆ دانواندن!

---

(١) ئیمامی تەبەری رەحمەتی خوای لێ بێ لە تەفسیرەكەیدا (١٤١/٨) دەفەرموێ : خوای گەورە دەفەرموێت رۆژێ كە ئەوانەی باوەڕیان بە قیامەت نیەو بتپەرستەكان و ئەوانەی غەیری خوا دەپەرستن لە فریشتەو ئینسان و جنۆكە كۆدەكرێنەوە.

ـــ ﴿وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ جَمِيعًا ثُمَّ يَقُولُ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ أَهَٰٓؤُلَآءِ إِيَّاكُمْ كَانُواْ يَعْبُدُونَ ﴿٤٠﴾ قَالُواْ سُبْحَٰنَكَ أَنتَ وَلِيُّنَا مِن دُونِهِم﴾ سبا/٤٠-٤١ واتە : لەو رۆژەدا كە خودای گەورە هاوەڵ پەیداكەران و پەرستراوەكانیان (فریشتەكان) كۆ دەكاتەوە، پاشان بە فریشتەكان دەفەرموێ : ئایا ئا ئەوانە كە ئێوەیان دەپەرست، ئێوە فەرمانتان پێكردبون؟ دەڵێن: پاكی بۆ تۆ خودایە! تۆ بەرزتری لەوەی كە كەس هاوەڵت بێ و هەر تۆ گەورەو خوداو پەرستراوی ئێمەی و ئێمە لەوان بێبەرین و تەنها تۆ دۆستی ئێمەی نەك ئەوان.

جا مەبەست لە پەرستنی فریشتە[1] لەم ئایەتەدا بەخودا دانانیانەو ملكەچ كردنە بۆ پەیكەرو وێنە خەیاڵیەكانیان هەروەك كە خەڵكی سەردەمی نەفامێتی وایان دەكرد، مەبەست لەمەش رازی كردنیان بو، بەو ئومێدەی گوایە داوای سۆزو بەزەییان لای خودای مەزن بۆ دەكەن و لە كاروباری دنیادا پشتیان دەگرن.

- ﴿وَيَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَضُرُّهُمْ وَلَا يَنفَعُهُمْ وَيَقُولُونَ هَٰٓؤُلَآءِ شُفَعَٰٓؤُنَا عِندَ ٱللَّهِ﴾ یونس/١٨ واتە : هاوەڵ پەیداكەران شتانێكی غەیری خودا دەپەرستن كە نەزیانیان پێ دەگەیەنن و نە قازانج، دەیانپەرستن و دەڵێن: ئەوانە تكاكاری لای خوای مەزنن ..

ـــ ﴿وَٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِهِۦٓ أَوْلِيَآءَ مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَآ إِلَى ٱللَّهِ زُلْفَىٰٓ﴾ الزمر/٣ واتە : ئەوانەی جگەلەخوا سەرپەرشتیاری تریان گرتوەو بە گەورەی

---

(1) گەلە نەفامەكانی تریش فریشتەیان بە خوا(God) داناوە.

خۆیان داناون دەڵێن : ئێمە بۆ ئەوە دەیانپەرستین تا پلەیەك لە خودامان نزیك بكەنەوەو بۆمان بپاڕێنەوە.

مەبەست لە عیبادەت لەم ئایەتەدا دیسان بەخودادانانە، و ئەو مەبەستەش تێیدا رون كراوەتەوە كە لەبەرچی هاوەڵ پەیداكەران دەیانپەرستن.

# پەرستن بەهەر سێ مانای بەندایەتی و گوێڕایەڵیکردن و بەخودا دانان

لە هەمو ئەو نمونانەی پێشەوە کە باسمان کرد تەواو رون دەبێتەوە کە وشەی (العبادة) لە قورئاندا لە هەندێ جێگادا بە هەردو مانای بەندایەتی بۆ کردن و بەگوێ کردن دێت و لە هەندێ جێگەی تردا تەنها بە مانای بەگوێ کردن دێت، و جێگای تردا تەنها بە مانای بەخودادانان دێت واتە: (التألـه) .. ئێستاش پێش ئەوەی ئەو نمونانە بهێنینەوە کە وشەی عیبادەت تیایاندا بە هەرسێ مانا پێکەوە هاتوە، ئەوا دەبێ ئاگات لە هەندێ شتی سەرەتایی هەبێت وەك ئەو نمونانەی کە لە پێشەوە هێنامانەوە کە هەمویان باسی پەرستنی غەیری خودا دەکەن، بەڵام ئەو ئایەتانەی کە وشەی عیبادەت تیایاندا بە هەردو مانای بەندایەتی و گوێڕایەڵی کردن هاتوە، ئەوا مەبەست لە زاراوەی پەرستراو تیایاندا یا شەیتانە یا ئەو ئادەمیانەن کە لە خودا یاخی بون و خۆیان کردوە بە تاغوت و خەڵکیان ناچار کردوە کە لەباتی بەندایەتی و پەرستن و گوێڕایەڵی کردنی خودای گەورە بەندایەتیان بکەن و گوێڕایەڵیان بکەن، یا مەبەست ئەو پێشەواو سەرۆکانەن کە خەڵکیان ژێربار هێناوە بۆ ئەو رێ وشوێن و شێوازی ژیانە کە دایان هێناوەو کتێبی خوداشیان کارکەنار کردوەو ئیشی پێ ناکەن و پشت گوێیان خستوە.

کەچی ئەو ئایەتانەی کە وشەی عیبادەت تیایاندا بە مانای (بەخودا دانان و گەورەگرتن) هاتوە ئەوا مەبەست لە پەرستراو (معبود) لەوێدا یا ئەو پێغەمبەرو پیاوچاك و دۆستانەی خودان کە خەڵکی بەخودای خۆیان دانابون، هەرچەندە

ڕێـی ڕاستیشـیان بـە خـەڵکی نیشـان دابـو و فێـری خوداناسـی و چـۆنیەتی پەرستنیان کردبون. یا مەبەست ئەو فریشتەو جنۆکانەن کە لەبەر ناحاڵی بونی خەڵکەکـە بـە هـاوەڵی خـودای گـەورەیان دانـابون و لـە هەڵسوڕانی یاسـاکانی سروشتدا بەشێك لـە دەسـەڵاتیان دابـونێ، یـا ئەوەتـە مەبەسـت وێنـەو پەیکـەری هێزە خەیاڵیـەکان بـون کـە ببـون بـە پەرستگاو ڕوگـەی نوێـژ و پاڕانـەوەیان کـە شەیتان فریوی دابون. قورئانی پیرۆز هـەمو ئـەو پەرستراوانە بـە پڕوپـوچ و بـێ بایەخ لە قەڵەم دەداو عیبـادەت کردنیـان بـە هەڵەیـەکی گـەورە دادەنـێ، جـا ئـەو عیبادەتە بەندایـەتی کـردن بوبێـت یـا گوێڕایـەڵیکردن و بـەگوێکردنیان بوبێـت، یاخود بەخودا دانانیـان بوبێـت، جیـاوازی نیـە، جـا قورئـان پێیـان دەفـەرموێت : هـەمو ئەوانـەی دەیانپەرسـتن بەنـدەی خـودان و شـایانی پەرسـتن نـین و لـە پەرستنیاندا بێجگـە لـە سەرشـۆڕیی و مایەپوچـی چـی ترتـان بـۆ نامێنێتـەوە، و خاوەنی ڕاستەقینەی ئەوان و هەرچـی لـە ئاسمانـەکان و زەویدایـە تـەنها خـودای بەرزو باڵادەستەو هەمو کاروبار و دەسەڵاتێك بەدەست ئەوە، کەواتە بێجگـە لـەو کەسی تر شایانی پەرستن نیەو نابێ کەسی تر بپەرسترێ.

ــ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ عِبَادٌ أَمْثَالُكُمْ ۖ فَٱدْعُوهُمْ فَلْيَسْتَجِيبُوا۟ (١) لَكُمْ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴾ الاعـراف/١٩٤ واتـە: ئەوانـەی ئێـوە لـەباتی خـودا بانگیـان دەکـەن وداوای جێبـەجێکردنی داخوازیـەکاناتانیان لـێ دەکـەن، هـەر بەندەی وەکو ئێوەن، ئەگەر ڕاست دەکەن دە بانگیان بکەن وداوایان لێبکەن وبا ئەوانیش وەڵامتان بدەنەوە بزانن هیچتان بۆ دەکەن؟

---

(١) مەبەسـت لـە (فليستجيبوا) لێرەدا وەڵامدانـەوەی بـە دەنـگ نیـە، بـەڵکو وەڵامدانـەوەی کرداریە بۆ داواکە وەك لەپێشەوە ئاماژەمان پێ کرد.

ـــ ﴿وَٱلَّذِينَ تَدۡعُونَ مِن دُونِهِۦ لَا يَسۡتَطِيعُونَ نَصۡرَكُمۡ وَلَآ أَنفُسَهُمۡ يَنصُرُونَ ﴾ الاعراف /١٩٧ واتــه : ئه‌وانــه‌ی ئێـوه لـه‌باتی خـودا بانگیـان ده‌كـه‌ن، نـه ده‌تـوانن ئێوه سه‌ر بخه‌ن و نه ده‌شتوانن خۆیان سه‌ر بخه‌ن.

ـــ ﴿ وَقَالُواْ ٱتَّخَذَ ٱلرَّحۡمَٰنُ وَلَدٗاۗ سُبۡحَٰنَهُۥۚ بَلۡ عِبَادٞ مُّكۡرَمُونَ ﴿٢٦﴾ لَا يَسۡبِقُونَهُۥ بِٱلۡقَوۡلِ وَهُم بِأَمۡرِهِۦ يَعۡمَلُونَ ﴿٢٧﴾ يَعۡلَمُ مَا بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ وَمَا خَلۡفَهُمۡ وَلَا يَشۡفَعُونَ إِلَّا لِمَنِ ٱرۡتَضَىٰ وَهُم مِّنۡ خَشۡيَتِهِۦ مُشۡفِقُونَ﴾ الانبيـــــاء/٢٦-٢٨ واتـــــه : هـــــاوه‌ڵ په‌یداكـه‌ران (توێـژه‌ره‌وانی قورئـان ده‌ڵـێن ئه‌وانـه كۆمـه‌ڵێك بـون لـه تـیره‌ی خوزاعه) گوتیان: خودا منـداڵی[١] هه‌یـه (مه‌به‌سـتیان ئـه‌وه‌بو كـه فریشـته كچـی خودان) نه‌خێر! فریشته به‌نده‌ی ڕێزلێگیراون وجێگای به‌رزیان هه‌یه‌و قسه لـه فه‌رمایشتی خـودادا ناكـه‌ن و بـه پێـی فـه‌رمانی ئـه‌و كارده‌كـه‌ن، خـودای گـه‌وره ئاشكراو نهێنیان ده‌زانێ، هه‌روه‌ها داوای لێخۆشبون بۆ كه‌سێ ناكـه‌ن تـا خـودای گه‌وره ڕازی نه‌بێ لێی چونكه له خودای مه‌زن ده‌ترسن.

- ﴿ وَجَعَلُواْ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةَ ٱلَّذِينَ هُمۡ عِبَٰدُ ٱلرَّحۡمَٰنِ إِنَٰثًاۚ ﴾ الزخرف/١٩ واته: فریشته كـه به‌نـده‌ی پـاكی خـودای میهره‌بـانن كافره‌كـان بـه مێینـه‌و كچـی خودایـان ده‌ناساندن!

- ﴿ وَجَعَلُواْ بَيۡنَهُۥ وَبَيۡنَ ٱلۡجِنَّةِ نَسَبٗاۚ وَلَقَدۡ عَلِمَتِ ٱلۡجِنَّةُ إِنَّهُمۡ لَمُحۡضَرُونَ ﴾ الصافات/١٥٨ واته: هاوه‌ڵپه‌یداكه‌ره‌كان په‌یوه‌ندی بـاوك ئـه‌ولادیی و خزمایـه‌تییان لـه نێـوان خودای گـه‌وره‌و جنۆكـه‌دا داده‌نـا ! ده‌یـانگوت خـودای گـه‌وره جنۆكـه‌ی كـرد بـه

---

[١] وشه‌ی (ولد) له زمانی عه‌ره‌بیدا كچ و كوڕ ده‌گرێته‌وه. (ئه.و)

هاوسەری خۆی و فریشتەیان لێ پەیدا بو، جنۆکەکان لە هاوەڵپەیداکەران باشتر دەزانن کە خودای گەورە ئەوانیش ئامادەی لێپێنەوە دەکات..

ـــ ﴿ لَّن يَسْتَنكِفَ ٱلْمَسِيحُ أَن يَكُونَ عَبْدًا لِّلَّهِ وَلَا ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ ٱلْمُقَرَّبُونَ ۚ وَمَن يَسْتَنكِفْ عَنْ عِبَادَتِهِۦ وَيَسْتَكْبِرْ فَسَيَحْشُرُهُمْ إِلَيْهِ جَمِيعًا ﴾ النسـاء/١٧٢ واتـە : هەرگیز مەسیح لوتبەرزی ناکا و بەلایەوە نەنگی نیە کە بەندایەتی خودای گەورە بکا، فریشتە نزیکەکانی خوداش فیزو دەمارگیری لەوەی کە بەندایەتی خودا بکەن نانوێنن ، هەر کەسێ فیزو لوتبەرزی و خۆبەزل زانین لە بەندایەتی کردنی خودادا بنوێنێ ئەوا رۆژی دوایی هەمویان کۆ دەکاتەوە بۆ سزادان و لێپرسینەوە زیندویان دەکاتەوە.

ـ ﴿ ٱلشَّمْسُ وَٱلْقَمَرُ بِحُسْبَانٍ ۝٥ وَٱلنَّجْمُ وَٱلشَّجَرُ يَسْجُدَانِ ﴾ الرحمن/٥-٦ واتە : مانگ و رۆژ بە یاسایەکی دیاریکراو کاتێکی رێکوپێکدا دەڕۆن و دەسورێنەوەو ئەستێرە [1] و درەختیش زێربارو جێبەجێکەری یاسای خودای گەورەن.

ـ ﴿ تُسَبِّحُ لَهُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ ٱلسَّبْعُ وَٱلْأَرْضُ وَمَن فِيهِنَّ ۚ وَإِن مِّن شَىْءٍ إِلَّا يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِۦ وَلَٰكِن لَّا تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ ﴾ الاسـراء/٤٤ واتـە : زەوی و هـەر حـەوت ئاسمـان و ئـەوەی تیایاندایە شایەدی بونی خوداو پاکی لە هەمو ناتەواویەك و یەکتایی دەدەن و

---

(١) مانـاکردنی (الـنجم) بـە ئەسـتێرەی ئاسمـان بۆچـونی (مجاهـد)ەو هەڵبـژاردەی (ابـن کثیر)یشە، هەندێ لە توێژەرەوانی قورئان وای بۆ چون کە (نجـم) هـەمو روەکێکە کە لە زەویدا ئەڕوێ و لق و پۆپی نیە، بەرامبـەر بـەو درەختـەی کە لق و پـۆپی هەیـە، ئەمـەش بۆچونی (ابن عباس )ەو هەڵبژاردەی (ابن جریـر)ە .. وا دیـارە بۆچونی یەکـەمیان راسـتر بێت.. بڕوانە (صفوة التفاسير ج٣/٢٩٤) (ئە.و)

هەرچی شتێك لە بونەوەردا هەبێ ئەم زیكرە دەكات، بەڵام ئێوە لە زمانی ئەو زیكرە تێناگەن.

- ﴿ وَلَهُۥ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ كُلّٞ لَّهُۥ قَٰنِتُونَ ﴾ الروم/٢٦ واتە : هەرچی لە ئاسمانەكان و زەویدایە هەموی هی خودایەو هەموشیان ملكەچی ئەون.

- ﴿مَّا مِن دَآبَّةٍ إِلَّا هُوَ ءَاخِذُۢ بِنَاصِيَتِهَآ ﴾ هود/٥٦ واتە : گیانداریك نیە بەسەر زەویدا بڕوا ئیللا ئاڕاستەی بەدەست خودای گەورەوەیە.

(الاخذ بالناصية) نمونەیەكە بۆ دەسەڵات و زاڵ بون و خاوەنداریتی.

ــــــ ﴿ إِن كُلُّ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ إِلَّآ ءَاتِي ٱلرَّحۡمَٰنِ عَبۡدٗا ﴿٩٣﴾ لَّقَدۡ أَحۡصَىٰهُمۡ وَعَدَّهُمۡ عَدّٗا ﴿٩٤﴾ وَكُلُّهُمۡ ءَاتِيهِ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ فَرۡدًا ﴾ مریم/٩٣-٩٥. واتە : هەرچی لە ئاسمانەكان و زەویدان، هەر هەمویان بە ملكەچێتی بەندانەوە دێنەوە حزوری خودای پەروەردگار. خودای گەورە سەرژمێری كردون و حاڵ و باریان ئاگادارەو رۆژی قیامەت هەمویان زیندو دەكرێنەوەو هەریەكەیان بەتەنها دێتەوە لای خودای گەورە.

ــ ﴿ قُلِ ٱللَّهُمَّ مَٰلِكَ ٱلۡمُلۡكِ تُؤۡتِي ٱلۡمُلۡكَ مَن تَشَآءُ وَتَنزِعُ ٱلۡمُلۡكَ مِمَّن تَشَآءُ وَتُعِزُّ مَن تَشَآءُ وَتُذِلُّ مَن تَشَآءُۖ بِيَدِكَ ٱلۡخَيۡرُۖ إِنَّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ﴾ آل عمـران/٢٦ واتـە: بڵـێ: ئەی خودایە، ئەی خاوەنی هەمو موڵكێك، تۆ بە ویستی خۆت موڵك وماڵ بە یەكێ دەبەخشی و لە یەكێكی دی دەستێنیەوە، سەربەرزی و پایەبەرزی بە یەكێك دەبەخشی كە ئارەزوت لێ بێت و لە یەكێكیشی دەگرییەوە كە ئارەزوت لێبێ لێی وەرگریەوەو بێ رێزی كەیت، خێرو چاكە هەموی بەدەست تۆیە، بەراستی تۆ ئەی خودای گەورە بەسەر هەمو شتێكا توانایت.

دوای ئەوەی کە قورئان بە بەڵگەوە سەلماندی کە هەمو ئەوانەی خەڵکی دەیانپەرستن بە شێوەیەك لە شێوەکانی پەرستن، ئەوا بەندەی خودانەو بێ دەسەڵاتن لە بەرامبەریدا، ئینجا مرۆڤ و جنۆکان بانگهێشت دەکا تا بە تەنها خودای گەورە بپەرستن و بە هەمو مانا جۆراوجۆرەکانی (عیبادەت) بەندایەتی ئەو بکەن.. کەوابو دەبێ بەندایەتی تەنها بۆ خودای گەورە بکرێت و هەر گوێڕایەڵی ئەو بکرێتو جگە لەو کەس بەخوداو گەورە نەگیرێت، و هیچ شتێك لە سێ واتاکانی (عیبادەت) بۆ کەسێکی تر و شتێکی تر جگە لە خودا بەجێ نەهێنرێت هەرچەند کەمیش بێت.

ـــــ ﴿ وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولًا أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ ﴾ النحل/٣٦ واتە: بە تەئکید لە هەمو نەتەوەیەك پێغەمبەرێکمان ناردوە کە پێیان راسپێرێت کە توخنی تاغوت مەکەون و لێی دورکەونەوە..

- ﴿وَالَّذِينَ اجْتَنَبُوا الطَّاغُوتَ أَن يَعْبُدُوهَا وَأَنَابُوا إِلَى اللَّهِ لَهُمُ الْبُشْرَىٰ﴾ الزمر/١٧. واتە : ئەوانەی وازیان لە تاغوت هێناو بڕیاریاندا چیدی نەپەرستن و بەرەو خودای گەورە گەڕانەوە، ئەوانە مژدەی خۆشیان دەدرێتێ.

ـــ ﴿أَلَمْ أَعْهَدْ إِلَيْكُمْ يَا بَنِي آدَمَ أَن لَّا تَعْبُدُوا الشَّيْطَانَ إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴿٦٠﴾ وَأَنِ اعْبُدُونِي هَٰذَا صِرَاطٌ مُّسْتَقِيمٌ﴾ یس/٦٠ واتە : ئەرێ ئەی نەوەی ئادەم پەیمانم لێوەرنەگرتن کە شەیتان نەپەرستن، چونکە دوژمنی سەرسەخت و ئاشکرای ئێوەیە، پەیمانم لێ وەرنەگرتبون کە دەبێ بە تەنها من بپەرستن، ئا ئەوەش رێبازی راست..

ـــ ﴿ ٱتَّخَذُوٓاْ أَحۡبَارَهُمۡ وَرُهۡبَٰنَهُمۡ أَرۡبَابٗا مِّن دُونِ ٱللَّهِ ﴾ التوبــة/٣١ واتە : جولەکەو دیانـەکان جیبرو راهیبکانی خۆیـان ـ کە پیاوانی دینەکەیان بون ـ لەباتی خودا کردبویاننە چاوساغ و ڕێنیشاندەری ژیانیان.

ـ ﴿وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُوٓاْ إِلَٰهٗا وَٰحِدٗا﴾ التوبـة/٣١ واتــە : هــەر فەرمانی ئەوەیان پێدرابو کە تەنها یەك خودا بپەرستن.

ـ ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُلُواْ مِن طَيِّبَٰتِ مَا رَزَقۡنَٰكُمۡ وَٱشۡكُرُواْ لِلَّهِ إِن كُنتُمۡ إِيَّاهُ تَعۡبُدُونَ ﴾ البقرة/١٧٢ واتە : ئەی ئیمانداران، لە پاکەکانی ڕۆزیەك بخۆن کە پێمــان بەخشــیون، ئەگــەر راســت دەکــەن و بەتــەنها ئــەو دەیپەرســتن شوکرانەبژێری خوداش بکەن..

خودای گەورە لـەم ئایەتانـەدا فـەرمان دەکات کـە بـە تـەنها ئـەو بپەرسـترێ، پەرستنەکەشـی بریتیـە لـە بەندایـەتی و گوێڕایـەڵی و ملکـەچ کـردن، نیشـانەی ئەمـەش لـە ئایەتەکانـدا بـاش بـەدیار دەکـەوێت چـونکە تیایانـدا خـودای گـەورە فەرمان دەکات کە لە گوێڕایەڵی کردنی شـەیتان وتـاغوت وقەشـەو مـالم و بـاب و باپیرە لەڕێدەرچوەکان دور کەونەوەو وەرنـە سـەر گوێڕایـەڵیکردنی خـودای تـاك وتەنها.

ــــــ ﴿قُلۡ إِنِّي نُهِيتُ أَنۡ أَعۡبُدَ ٱلَّذِينَ تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ لَمَّا جَآءَنِيَ ٱلۡبَيِّنَٰتُ مِن رَّبِّي وَأُمِرۡتُ أَنۡ أُسۡلِمَ لِرَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾ غـافر/٦٦ واتـە : بـەو کافرانـە بڵـێ : مـن لـەو کاتـەوە کـە نیشـانەو بەڵگـەی خـواییم پـێ گەیشـتوە، ڕێـی ئـەوەم لـێگیراوە کـە ئەوانە بپەرستم کە ئێوە لەباتی خودای گەورە هاناو هاواریان دەبەنە بەر، مـن فەرمانی ئەوەم پێکراوە کە ملکەچیەکی تەواو بۆ خودای جیهانیان دەربڕم..

ـ ﴿ وَقَالَ رَبُّكُمُ ٱدْعُونِىٓ أَسْتَجِبْ لَكُمْ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِى سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ ﴾ غافر/٦٠ واته: پەروەردگارتان فەرموی: لێم بپاڕێنەوەو هاوار لە من بکەن، منیش وەڵامتان دەدەمەوەو بە دەنگتانەوە دێم، بەڕاستی ئەوانەی بە فیزو دەمارن و پێیان کەمییە دەست بەرز کەنەوەو لە خودا بپاڕێنەوە، ئەوا بەسەرشۆڕیەوە فڕێدەدرێنە ناو دۆزەخەوە.

ـ ﴿ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمْ لَهُ ٱلْمُلْكُ ۚ وَٱلَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِهِۦ مَا يَمْلِكُونَ مِن قِطْمِيرٍ ﴿١٣﴾ إِن تَدْعُوهُمْ لَا يَسْمَعُوا۟ دُعَآءَكُمْ وَلَوْ سَمِعُوا۟ مَا ٱسْتَجَابُوا۟ لَكُمْ ۖ وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ يَكْفُرُونَ بِشِرْكِكُمْ ﴾ فاطر/١٣،١٤ واتە: ئەمە ئەو خودا گەورەیەی پەروەردگاری ئێوەیە کە هەمو خاوەنێتی و دەسەڵاتێك هی ئەوە ، ئەوانەی غەیری خودا کە هاناو هاواریان دەبەنە لاو بانگیان دەکەن موڵکیان بەقەدەر ئەو پەردە تەنکەی سەر ناوکی خورما لەم گەردونەدا نیە، جگە لەوەی بێ تواناو بێ دەسەڵاتن، کاتێ کە هانایان بۆ دەبەن پاڕانەوەو لالانەوەکەتان نابیستن! چونکە گوێیان لێ نیە، ئەگەر گوێشیان لێ بێت توانای وەڵام دانەوەیان نیە، ڕۆژی دوایی کاتێ خودای گەورە بەدەنگیان دێنێت خۆیانتان لێ بێ بەری دەکەن و نکوڵی دەکەن و لەوەش تووڕە دەبن کە ئەوانتان لە ژیانی دنیادا بە هاوەڵی خودای گەورە گرتوەو بەندایەتیتان بۆ کردون.

ـ ﴿ قُلْ أَتَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَمْلِكُ لَكُمْ ضَرًّا وَلَا نَفْعًا ۚ وَٱللَّهُ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴾ المائدة/٧٦ واتە : ئایا ئێوە بێجگە لە خوا شتێك دەپەرستن کە ناتوانێ نە زیانتان لێ بدات و نە قازانجتان پێ بگەیەنێ ، ئێ خۆ خودای گەورە گوێی لە داواکانتانەو بە حاڵ و کردەوەتان زانایە.

خودای گەورە لەم ئایەتانەدا فەرمانمان پێدەکات کە پەرستن بە مانای بەخودا دانان (التأله) تایبەت بکرێت تەنها بۆ ئەو، نیشانەو بەڵگەی ئەمەش بە ئاشکرا لە ئایەتەکاندا دیارە کە وشەی (العبادة) تیایاندا بە مانای پاڕانەوە هاتوەو عادەتەن لە پێش و پاشی ئەو ئایەتانەدا هاتون کە باسی ئەو خودا داتاشراوانە دەکەن، کە لە پەروەردگارێتی و بەڕێوەبردنی پاساکانی ئەو دیوی سروشتەوە کردبویانن بە هاوەڵی خودای گەورە.

ئێستا بۆ هەمو ژیرێك رون بوەوە کە هەر کاتێ لە قورئاندا وشەی (العبادة) هات و هیچ شتێك یا بەڵگەیەك نەبو لە ئایەتەکانی پێش و پاشی ماناکەی بۆ شتێکی تایبەت دیاری بکات، حەتمەن واتای یەکێك لە سێ ماناکانی دەبەخشێت، سێ مانای (بەندایەتی و گوێڕایەڵی و بەخودادان) ە.

بۆ نمونە سەیری ئەم ئایەتانەی خوارەوە بکە :

- ﴿ إِنَّنِيٓ أَنَا ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعۡبُدۡنِي ﴾ طه/١٤. واتە : بە تەئکید ئەوە منم خودام، هیچ خوایەك نیە شیاوی پەرستن بێت جگە لە من، دەی سا تۆش بمپەرستە..

— ﴿ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمۡۖ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ خَٰلِقُ كُلِّ شَيۡءٖ فَٱعۡبُدُوهُۚ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ وَكِيلٞ ﴾ الأنعام/١٠٢ واتە : ئەو خودایەی کە پەروەردگاری ئێوەیە، تاك و تەنهایەو هەر ئەو شایانی پەرستنەو هیچ پەرستراوێکی تر نیە جگە لەو، بەدیهێنەری هەمو شتێکە، دەی سا بەتەنها ئەو بپەرستن و بەندایەتی بۆ ئەو بکەن، ئەو هەڵسوڕێنەری هەمو شتێکە..

ـــ ﴿ قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِن كُنتُمْ فِى شَكٍّ مِّن دِينِى فَلَآ أَعْبُدُ ٱلَّذِينَ تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلَٰكِنْ أَعْبُدُ ٱللَّهَ ٱلَّذِى يَتَوَفَّىٰكُمْ ۖ وَأُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾ يـــــونس/١٠٤

واته : بڵێ : ئەی خەڵکینە ئەگەر ئێوە گومانتان لە راستی ئایینەکەم هەیە [١]، ئـەوا مـن ئەوانـەی ئێـوە ناپەرسـتم کـە هاواریـان دەکـەنێ، مـن ئـەو خودایـە دەپەرستم کە دەتان مـرێنێ و قـازانج و زیانتـان بەدەسـتی ئـەوە، مـن فـەرمانم پێکراوە لە ریزی ئیمانداراندا بم.

ـ ﴿ مَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِهِۦٓ إِلَّآ أَسْمَآءً سَمَّيْتُمُوهَآ أَنتُمْ وَءَابَآؤُكُم مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ بِهَا مِن سُلْطَٰنٍ ۚ إِنِ ٱلْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ ۚ أَمَرَ أَلَّا تَعْبُدُوٓا۟ إِلَّآ إِيَّاهُ ۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ ﴾ یوسف/٤٠ واتـە : ئەوانەی کە ئێوە دەیانپەرستن، هەر ناوی بێ نێومرۆکن و هیچ دەسـەڵاتێکیان نیە، خۆتان و باب و باپیرانتان داتانهێناون و ناوتان ناون خـودا، خـودای گـەورە فەرمانی نەکردوە بە پەرستنیان و رێـی پـێ نـەداوە، ئێـوە هـیچ بەڵگەیـەکیتان دەربارەیان نیە، فەرمانڕەوایی تایبەتە بە خودا، خودا فەرمانی کردوە کە جگە لەو بەندایەتی هیچ شتێکی تر نەکەن و هیچی تر نەپەرستن، ئەمەیە رێگـەی راست و ئاییینی رێك و پێك.

ـــ ﴿ وَلِلَّهِ غَيْبُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَإِلَيْهِ يُرْجَعُ ٱلْأَمْرُ كُلُّهُۥ فَٱعْبُدْهُ وَتَوَكَّلْ عَلَيْهِ ﴾ هود/١٢٣ واتە: زانینی نادیارو پەنهانی ئاسمانەکان و زەوی ماف و توانای خودای گەورەیـەو هـەمو کاروبارێـك بـۆ لای ئـەو دەگەڕێتـەوە، دە تـۆش هـەر ئـەو بپەرستەو لە هەمو کارو کردارێکتدا پشتی پێ ببەستە.

---

([١]) تەبەری دەفەرموێ : ئەمە وەکو ئەوە وایە کە بڵێ : پێویست ناکا گومـان لـە دیـنی مـن بکەن، کە بەڵگەم هەیە، بەڵکو گومان لەو بتانە بکەن کە هیچیان بەدەست نیە.

ـ ﴿لَهُۥ مَا بَيۡنَ أَيۡدِينَا وَمَا خَلۡفَنَا وَمَا بَيۡنَ ذَٰلِكَۚ وَمَا كَانَ رَبُّكَ نَسِيّٗا ٦٤ رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَيۡنَهُمَا فَٱعۡبُدۡهُ وَٱصۡطَبِرۡ لِعِبَٰدَتِهِۦۚ﴾ مریم/٦٤-٦٥ واتە: خودای گەورە ئاگای لە هەمو كردەوەیەكمانە؛ ئەوی لەرابردودا كردومانەو ئەوی بە دەستمانەوەیەو ئەوی لە داهاتودا دەیكەین، پەروەردگارت هیچی لەبیر ناچێ، پەروەردگار هەڵسورێنەرو ئاڕاستەوانی ئاسمانەكان وزەوی و هەرچی لە نێوانیاندایە، دەی سا بیپەرستەو سەبری ئیزاقی لەسەر پەرستنی خوا بەخۆت دە.

ـ ﴿فَمَن كَانَ يَرۡجُواْ لِقَآءَ رَبِّهِۦ فَلۡيَعۡمَلۡ عَمَلٗا صَٰلِحٗا وَلَا يُشۡرِكۡ بِعِبَادَةِ رَبِّهِۦٓ أَحَدَۢا﴾ الكهف/١١٠ واتە: جا ئەوەی ئومێدی بە دیداری پەروەردگاری خۆی هەیە و دەیەوێ پاداشتی خودای دەست كەوێ و لە سزای وەدور كەوێتەوە، با لەبەر خاتری خودا كردەوەی چاك و پوخت بكات (واتە بەپێی شەرعی خودا بێ ولە پێناوی خوداش بێ، كە ئەوەش دو مەرجی قبوڵ بونی كردەوەی بەندەكانن) با ریای تێكەڵ نەكات.

لەم ئایەتانەدا وشەی (عیبادەت) بە مانای (بەخودا دانان، و بەندایەتی وگوێڕایەڵی) هاتوە، پێویست ناكات وشەی (عیبادەت)ەكە تایبەت بكرێ بە یەكێك لە واتاكانی. قورئان كاتێ باسی عیبادەت دەكات دەیەوێ ئەوە لە مرۆڤ بگەیێنێ كە خودایەتی و بەندایەتی بۆ كردن و گوێڕایەڵیكردن بە تەنها بۆ خودای مەزن دەبێ ئەنجام بدرێت، دەبێ مرۆڤ ئەوەش تەنها بۆ خوا بە دڵسۆزی و پاكی ئەنجام بدات.. ئەگەر ئێمە بمانەوێت وشەی (عیبادەت) تەنها لە یەك مانایدا كورت بكەینەوە وەكو (دروشمەكانی پەرستن)، ئەوە لە راستیدا مانای كورت هەڵهێنانی بانگەوازی قورئانە. ئەنجامی مسۆگەری ئەو كورت هەڵهێنانە ئەوە دەبێ كە خەڵكی بەو شێوە كورتبینیە باوەڕ بە دینی خوا دەهێنن و وا دەزانن بانگەوازی قورئان بەدەوری چەند چەمك و مانایەكی

بەرتەسك و دیاریکراودا دەخولێتەوە، ئەوە بێگومان بیروبۆچونێکی تەسك بینانەی دیاریکراوی دەبێت، جا کاتێك کابرا هەمو دینەکەوا کەم و کورت دەبینی ئیتر بەشێوەیەکی ناتەواو شوێن تەنها دروشم و ڕێنماییەکانی نوێژو ڕۆژوەکە دەکەوێت.. واش حاڵی دەبێت کە دینەکە هەر ئەوەندەیە.. ئەوەش ئەو کێشەیە کە ئەم کتێبەمان بۆ چارەسەری نوسی..

## پاشکۆیەکی کورتی وەرگێڕ

مامۆستا مەودودی رەحمەتی خوای لێ بێ مانای عیبادەتی لەو سێ مانایەدا (بەخودا دانان، و بەندایەتی، گوێڕایەڵی) دیاری کردوە کەچی مامۆستا نوێخوازەکانی سەردەم وەکو (سید قطب و محمد قطب و یوسف القرضاوي) بەشێوەیەکی وا لێك دەدەنەوە کە هەمو لایەنەکانی ژیان بگرێتەوەو ئەویش لەژێر تیشکی ئەو دو ئایەتە پیرۆزەدا کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴾ الذاريات/٥٦. واتە : جنۆکەو بنیادەمم تەنها بۆ ئەوە دروست کردوە کە بمپەرستن.. واتە ژیانی مرۆڤ هەموی پەرستنە. هەروەها دەفەرموێت: ﴿ قُلْ إِنَّ صَلَاتِى وَنُسُكِى وَمَحْيَاىَ وَمَمَاتِى لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾ الأنعام،١٦٢ واتە: بڵێ : نوێژکردن و قوربانی کردن و ژیان و مردنم هەموی بۆ پەروەردگاری جیهانەکانە. لەم ئایەتەدا وشەی (صلاتي ) هەمو دروشمە پەرستنەکانی ژیانی مرۆڤ دەگرێتەوە، وشەی (نسکي) هەمو جموجوڵی ژیان دەگرێتەوە، وشەی (محياي) ژیان بەهەمو جموجوڵەکانیەوە دەگرێتە خۆی کە دەبێ لەپێناوی خوادا بێ نەك شتی تر، هەروەها (مماتي) مردنێك بێ لە رێی خوادا بێ نەك لە رێی تردا. بەگشتی ژیان هەموی بەندایەتی و پەرستنی خوای گەورەیە، جا دەبێ هەوڵدەی لەو بازنەی تەوحیدە دەرنەچی بۆ بازنەکانی دی، کە بازنەی هاوەڵ بۆ خودا پەیداکردنن..

# چوارەم: ئایین ( الدین )

## لێکۆڵینەوەی زمانەوانی

وشەی (دین) [١] لە زمانی عەرەبیدا بە زۆر مانا بەکار دێت لەوانە : [٢]

١. ناچارکردن و دەسەڵات و حوکمڕانی و فەرمانکردن.. ناچارکردنی کەسێك بۆ گوێڕایەڵی کردن وبەکارهێنانی هێزی ناچارکەر (Sovereignty) بە سەریداو کردنی بە بەندەو گوێڕایەڵ، دەڵێن:

★ (دانَ الناسَ): واتە خەڵکەکەی ناچار کرد بۆ گوێڕایەڵی کردن. کە دەڵێی (دِنتهم فدَانوا) واتە ناچارم کردن و ئەوانیش گوێڕایەڵیان کردم .

★ (دانَ الرجُلُ): کابرا بوە خاوەنی عیززەت وسەربەرز بو .

★ (دِنتُ الرُجُلَ): واتە پیاوەکەم ناچار کرد ئەو ئیشە بکات کە پێی ناخۆشە، (دین فلان) واتە فلان کەس ناچارکرا ئیشێك بکا کە پێی ناخۆشە.

★ (دنتـهُ): واتـە کاروبـاریم بـەڕێوە بـردو خسـتمە ژێـر رکێفـی خۆمـەوە ، (دیتتـهُ القـومَ) واتـە سیاسـەت و کاروبـار بـەڕێوەبردنیانم خسـتە دەسـتی ئـەو . هەروەها شاعیر حوتەیئە (الحَطیئة) دایکی دەدوێنێ و دەڵێ :

---

([١]) ئیبن فارس لە (مقاییس اللغة بەرگی ٢ لا ٣١٩)دا لە ماددەی (دین)دا دەڵێ : دال و یـاو و نون یەك بنچینەن، هەمو لقەکان دەگەڕێنەوە بۆی، ئەویش بریتیـە لـە جۆری ملکەچی و خۆبەدەستەوە دان.

([٢]) سەیری (لسان العرب بەرگی ١٧ لا ٢٤-٣٠) بکە.

لقد ديَّتتِ امرَ بنيكِ حتى تركتِيهمْ أدقّ مِن الطحينِ [1]

واته : سياسەتی تۆ لەبارەی بەڕێوەبردنی کاروباری منداڵەکانت بە چەند شتێك بو کە وەختێك ئەوانت بەجێ هێشت لە ئارد نەرمتر بوبون.

پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: ((الكَيِّسُ مَنْ دَانَ نَفْسَهُ وَعَمِلَ لِمَا بَعْدَ الْمَوتِ )) واتە کەسی ژیر و زرنگ ئەو کەسەیە کە نەفسی خۆی زەبون و ملکەچ بکاو باری بێنێ و ئیش بۆ دواڕۆژی بکا.

هەر بۆیە بە کەسێکی زاڵ و دەسەڵاتدار بەسەر ناوچەیەك یا نەتەوەیەك یا هۆزو عەشیرەتێك، هەروەها بە حاکمی فەرمانڕەوا دەوترێت (دیّان) . شاعیر ئەعشای حەرمازی کە پێغەمبەری ﷺ دەدواند دەیگوت : (یا سیدَ الناسِ وديَانَ العرب) واتە : ئەی گەورەی هەمو خەڵکی و ئەو کەسەی کە بەسەر هەمو عەرەبدا زاڵ بویت !

لەسەر ئەم بنەڕەتە بە بەندە و کۆیلە دەوترێت (مدین) و بە ئافرەتی کۆیلە واتە کەنیزەك دەوترێت (المدينة) و (ابن المدينة) واتە کوڕی بەندەیەکی ئافرەت، هەروەك (أخطل) دەڵێت:

ربَّت و ربَا في حجرها ابنُ المدينة [2]

واتە : کوڕی ئافرەتە ئافرەتە کۆیلەکە لە باوەشیدا پەروەردە کرا.

---

([1]) ئەم بەیتە لە (لسان العرب بەرگی ١٧ لا ٢٨)دا هەیە، و (اساس البلاغة) بەرگی ١ لا ٢٩١ و لە (دیوان الحطيئة)دا گێڕدراوەتەوە (٦١) (وقد سوست امر بنيك......)

([2]) ئەم بەیتە لە دیوانی ( أخطل )دا هەیە ، و (لسان العرب بەرگی ١٧ لا ١٨٨ و ١٨٩)، و بەرگی ١٣ لا ٣١٣، و (معجم مقاييس اللغة بەرگی ١ لا٣٣٤ و بەرگی ٢ لا ٣١٩).

له قورئانیشدا هاتوه: ﴿فَلَوۡلَآ إِن كُنتُمۡ غَيۡرَ مَدِينِينَ ﴿٨٦﴾ تَرۡجِعُونَهَآ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ﴾ الواقعة/٨٦، ٨٧. واته : ئەگەر راست دەکەن ئێوە لە ژێر هێزو دەسەلاتی خوادا نین و لێتان ناپرسرێتەوە لە کردەوەکانتان، دەی بۆچی گیان وەبەر ئەو مردوەدا ناکەنەوەو دەهێڵن بمرێ ؟!

٢- گوێڕایەڵی کردن و بەندایەتی و خزمەتچیەتی و ژێردەست بونی یەکێك و بەقسەکردن و قبوڵ کردنی فەرمان و ژێردەستی و ملکەچ بون لەژێر دەسەلاتیدا.

★ دەڵێن: (دنتهم فدانوا) واتە : ناچار و ژێربارم کردن و ئەوانیش گوێڕایەڵیان کردم.

★ (دِنتُ الرَّجُلَ) خزمەتم کرد.

هەروەها لە فەرمودەی پێغەمبەر ﷺدا هاتوە : (( أُرِيدُ مِنْ قُرَيشٍ كَلِمَةً تَدِينُ بِهَا الْعَرَبُ)) واتە: وتەیەکم لە قورەیش دەوێ بیڵێن کە عەرەب ملکەچ و گوێڕایەڵ دەکا بۆیان و لە بەرامبەریاندا سەریان بۆ نەوی دەکەن.

هەر بەم مانایە بە نەتەوەیەکی گوێڕایەڵ دەگوترێت (قومٌ دَيِّنٌ) ، هەر بەم مانایە وشەی (دین) لە فەرمودەی تایبەت بە (خوارج)دا هاتوە کە ((يَمْرُقُونَ مِنَ الدِّينِ مُرُوقَ السَّهْمِ مِنَ الرَّمِيَّةِ)).[1] واتە : خەواریجەکان خێرا لە گوێڕایەڵی

---

([1]) مەبەستی فەرمودەکە ئەوە نیە کە (خەوارج) لە دین دەرچون، نا، چونکە سەیدنا عەلی خوا لێی رازی بێت کە لێیان پرسی ئایا ئەوانە کافرن؟ فەرموی: لە کوفر هەلاتون، وتیان: ئەدی دورون؟ فەرموی: دوروەکان زۆر کەم یادی خوا دەکەن، بەلام ئەوان بەیانی و ئێواران یادی خوا دەکەن.. جا لەوەوە دەردەکەوێ کە مەبەست لە ( دین ) لەو فەرمودەیە گوێڕایەڵی کردنی پێشەوایە، و (ابن الأثير) لە کتێبی (النهاية) بەو مانایە لێکی داوەتەوەو

کردنی پێشەوا دەردەچن وەك دەرچونی تیر لە کەوانەوە .

٣. شەرع و یاسا، دەستور، رێگەورێباز، بەرنامە، باو نەریت.

کە دەڵێن (ما زالَ ذلكَ دِيني و دَيدَني) واتە هێشتا ئەوە خو و نەریت و عادەتی منە. دەڵێن (دان) بۆ کەسێك کە لەسەر خێر یان شەڕ ڕاهاتبێ.

لە فەرمودەی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە ((كانَت قُرَيشُ وَمَن دَانَ بِدِينِهِم )) واتە: قورەیش و ئەوەی لەسەر رێگەو باو نەریتی قورەیش بێ، و تیایا هاتوە کە (انَّهُ عَليهِ السَّلامُ كانَ علَى دِينِ قَومِهِ) واتە لەسەر ئەو سنور و بنچینەو باوو رێورەسمانە دەڕۆیشت کە لە ناو نەتەوەکەیدا باو بون، لە بارەی ژن مارەکردن و تەڵاق و میرات و چەند شتی تری شارستانی و کۆمەڵایەتی.

٤. سزاو پاداشت دانەوە، خەڵات کردن وبڕیاردانی حوکم ولێپرسینەوە:

لە پەندە عەرەبیەکاندا هاتوە (كمَا تَدِينُ تدَانُ) واتە چۆن لەگەڵ خەڵکیدا بجوڵێیتەوە هەر بەو شێوەش لەگەڵتدا دەجوڵێنەوە. چی بچێنیت هەر ئەوە دەدوریتەوە.

قورئانی پیرۆز بەم شێوەیە گوفتار و قسەی بێباوەڕان دەگێڕێتەوەو دەفەرموێت: (أَإِنَّا لَمَدِينُونَ) واتە ئایا ئێمە لێمان دەپرسرێتەوەو سزای خراپەکاریمان هەیە؟ یا لە فەرمودەیەکدا کە عەبدوڵای کوڕی ئیمامی عومەرەوە خودا لێیان رازی بێت دەیگێڕێتەوە: پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمویەتی: (لاَ تَسُبُّوا السلاطين، فان كان لابد فقولوا اللهُمَّ دِنْهُمْ كمَا يَدِينُونَ) واتە : جوێن بە فەرمانڕەواکان مەدەن، ئەگەر ناچار بون (لەبەر ئەوەی خراپ

---

دەڵێ: مەبەست لە دین بەگوێکردنە، واتە ئەوان لەگوێڕایەڵی پێشەوای هەق دەردەچن..
(بەرگی ٢ لا ٤١-٤٢).

بـون) ئـەوا بڵـێن خودایـە ئـەوان چـیمان بەسـەردێنن تـۆش ئاوایـان بەسـەردا بێنەوە.

لێرەوە وشەی (الدیّان) بـە مانـای قـازی و داوەری دادگـا دێـت، لـە پیرێکیـان دەربـارەی سـەیدنا عـەلی کـوڕی ئـەبو تالیـب خـودا لێـی رازی بێـت، پرسـی لەوەڵامـدا گـوتی: (إنـَّهُ کـانَ دَیّـانُ هـذهِ الأمّـةِ بَعْـدَ نَبیِّهَـا) واتـە: ئـەو دوای پێغەمبەرﷺ گەورەترین قازی ئەم ئوممەتە بو.

## بەکارهێنانی وشەی ( دین ) لە قورئاندا

لەوەی کە لە پێشەوە سەبارەت بە وشەی (دین) باسمان کرد دەردەکەوێ کە چەمکی ئەم وشەیە لەسەر چوار مانا بنیات نراوە، یا بە دەربڕینێکی تر وشەی (دیـن) لـە بـیر و زەیـنی هـەر تـاکێکی عەرەبیـدا چـوار مانـای بنـەڕەتی دەدا بەدەستەوە:

یەکەم : زاڵ بون و ناچارکردن لەلایەن خاوەن دەسەڵاتێکی بەرزەوە .

دوەم : گوێڕایـــەڵی کـــردن و بەندایـــەتی بـــۆکردن وپەرســـتن لەلایـــەن ملکەچێکەوە بۆ خاوەن دەسەڵاتێك.

سێیەم: ئەو سنورو یاساو ڕێبازانەی کە خەڵکی پێڕەویـان دەکـەن وشـوێنیان دەکەون.

چوارەم: لێپرسینەوەو داوەریکردن و پاداشت و تۆڵەوەرگرتنەوە.

عەرەبـەکان بـەر لـە هـاتنی ئـاینی ئیسـلام بـە پێـی زارگـۆتن (لەهجـە) جیاجیاکانی خۆیان،وشەی (دین) یان جارێك بە یەکێك لەو مانایانـەی سـەرەوە بە کار دەهێناو جارێکی دی بە مانایەکی تری، بەڵام تێڕوانینیان بۆ ئـەم چـوار

مانایه رون و ئاشکرا نەبو و دوربینی و بەرزێتی پێوه دیار نەبو، لەبەر ئەوه بە کارهێنانی وشەی (دین) تێکەڵاوی خلتەو پلتەو تەم و مژو نادیاری بوبو، هەر بۆیه بواری ئەوه نەڕەخسابو کە ئەم وشەیه ببێتە زاراوەیەك لە زاراوه پتەوه فیکریەکان لای ئەوان، تا قورئان هاتە خوارەوەو ئەو وشەیه کە رێك و هاوئاهەنگ بو لەگەڵ ئامانجەکانیدا بۆ دەربڕینی مەبەستەکانی قورئانی بە شیاو زانی، بۆیه بۆ مانا دیارو دیاریکراوەکانی بەکاری هێنا، هەڵیبژاردو کردی بە زاراوەیەکی تایبەتی خۆی. لەبەر ئەمەیە کە دەبینی لە قورئاندا وشەی (دین) جێگەی سیستمێکی تەواو دەگرێتەوه کە لەچوار بەش پێك دێت :

١ـ فەرمانڕەوایەتی و دەسەڵاتی هەرمبەرز.

٢ـ گوێڕایەڵی وملکەچی بۆ ئەو فەرمانڕەوایەتی ودەسەڵاتە.[1]

٣ـ یاساو رێساو دەستوری سیستمێکی فیکری یان سیاسی یان کۆمەڵایەتی.

٤ـ موحاسەبەو پرسینەوەو دیاری کردنی سزاو پاداشتی ئەو کارانەی ئەنجام دراون..

قورئان جارێك وشەی (دین) بە مانای یەکەم و دوەم بەکار دێنێ، و جارێکی تریش بە مانای سێیەم و هەندێ جاریش بەمانای چوارەم. هەندێ جار کە وشەی (دین) بەکار دێنێت مەبەستی لەیەك کاتدا هەر چوار بەشەکەیەتی، واتە ئەو نیزام و رێسا تەواو و رێکوپێکەی لە پێشەوه ئاماژەی پێکرا، رەچاو کراوه.

بۆ رونکردنەوەی ئەم بابەتە وا چاکە سەیرێکی ئەم ئایەتانەی خوارەوه بکەین :

---

[1] بڕوانە پاشکۆ کورتەکەی دوای ئەم بەشه..

## بەكارهێنانی وشەی ( دین ) بەمانای یەكەم و دووەم

ـ ﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ قَرَارًا وَٱلسَّمَآءَ بِنَآءً وَصَوَّرَكُمْ فَأَحْسَنَ صُوَرَكُمْ وَرَزَقَكُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ ۚ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمْ ۖ فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٦٤﴾ هُوَ ٱلْحَىُّ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ فَٱدْعُوهُ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ ۗ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾ غافر/٦٤-٦٥ واتە: (اللە) ئەو زاتەیە كە زەوی بۆ كردونە جێی دابین بون و نیشتەجێ و ئاسمانی وەكو بنمیچێكی پارێزگار بۆتان داناوە و بە جوانترین و تەواوترین شێوە ئێوەی ئادەمی دروست كردوەو وێنەی كێشاون ولە پاك وحەڵاڵ پشكەرزقی خۆتانی پێداون. ئەوە (اللە) ی پەروەردگاری ئێوەیە، رێزو فەڕو بەرزو پیرۆزی هەر بۆ ئەوە كە پەروەردگاری هەموو جیهانیانە. هەر ئەو زیندووەو نامرێ، هیچ پەرستراوێكی دیكە نییە جگە لەو، دەسا هانا تەنها بۆ ئەو بەرن و دینداریی راستتان بۆ ئەو تەرخان كەن، سوپاس بۆ خودای پەروەردگاری هەموو جیهانیان.

ـ ﴿قُلْ إِنِّىٓ أُمِرْتُ أَنْ أَعْبُدَ ٱللَّهَ مُخْلِصًا لَّهُ ٱلدِّينَ ﴿١١﴾ وَأُمِرْتُ لِأَنْ أَكُونَ أَوَّلَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴾، ﴿قُلِ ٱللَّهَ أَعْبُدُ مُخْلِصًا لَّهُۥ دِينِى ﴿١٤﴾ فَٱعْبُدُوا۟ مَا شِئْتُم مِّن دُونِهِۦ ﴾ الزمر/١١-١٢،١٤-١٥ واتە : بڵێ : مـن فەرمانم پێكراوە كە سەرڕاستانەو بەدڵسۆزی خودا بپەرستم و دین و دینداریی خۆم بۆ ئەو یەكلابكەمەوە[1]. فەرمانم پێكراوە كە یەكەمین مسوڵمان بم كە واز لە ئایینی.. خودا بەتەنها دەپەرستم و دینداری خۆمی بۆ یەكلا دەكەمەوەو تەقوای خۆمی بۆ پاڵفتە دەكەم، ئێوە كەیفی خۆتانە! هەرچییەك غەیری خودا دەپەرستن بیپەرستن.

---

(١) توێژەرەوانی قورئان دەفەرمون: خوای گەورە روی لە پێغەمبەرﷺ كردوە تا خەڵكی وا حاڵی بێ كە ئەوان دەبێ زیاترو زوتر روبكەنە خوا.

ـــــ ﴿وَالَّذِينَ اجْتَنَبُوا الطَّاغُوتَ أَن يَعْبُدُوهَا وَأَنَابُوا إِلَى اللَّهِ لَهُمُ الْبُشْرَىٰ﴾، ﴿إِنَّا أَنزَلْنَا إِلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ فَاعْبُدِ اللَّهَ مُخْلِصًا لَّهُ الدِّينَ ﴿٢﴾ أَلَا لِلَّهِ الدِّينُ الْخَالِصُ﴾ الزمــر/١٧، ٣-٢ واتــه: ئەوانــەی بــۆ پەرســتن و گوێڕایــەڵیی تــوخنی تــاغوت نەکــەوتن و گەڕانەوە لای خودا، مزدەی خۆشیان پێ دەدرێ.. بەراستی ئێمە کتێبێکمان بە هەق بۆ ناردوی، دەی سا تۆش تەنها خودا بپەرستەو دین و دینداریتی خۆتی بۆ یەکلا بکەرەوە. دین و دینداریتی دەبێ بە خوای پەروەردگارەوە تایبەت کرێن..

ـ ﴿وَلَهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَلَهُ الدِّينُ وَاصِبًا ۚ أَفَغَيْرَ اللَّهِ تَتَّقُونَ﴾ النحـل/٥٢ واتە: هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدایە هی خودایەو ئەو بەدیهێناون و هەمو بەندەی ئەون، دین و گوێڕایەڵیکردنی تەواو پێویست و بەردەوام تەنها بۆ خودایە.. چما ئێوە لە غەیری خودا دەترسن؟

ـــــ ﴿أَفَغَيْرَ دِينِ اللَّهِ يَبْغُونَ وَلَهُ أَسْلَمَ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ طَوْعًا وَكَرْهًا وَإِلَيْهِ يُرْجَعُونَ﴾ آل عمران/٨٣ واتە: چما غەیری ئایینی خوایان دەوێ؟! لە کاتێکدا کە هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدان پێیان خۆش بێ یان پێیان ناخۆش بێ گەردن کەچی فەرمانی ئەون، هەمووش هەر بۆ لای ئەو دەگەڕێنەوە؟

ـ ﴿وَمَا أُمِرُوا إِلَّا لِيَعْبُدُوا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ حُنَفَاءَ﴾ البینـة/٥ واتـە: بە تەئکید فەرمانیان وا پێدرابو کە بەندایەتی و پەرستن تەنها بۆ خوا ئەنجام بدەن و دین و دیندارێتیەکی ساغ تایبەت بە خوای گەورە بکەن و سەرڕاستانە لا کەن بە لای حەق حەقخوازییەوە ..

لەو هەمو ئەوئايەتانەدا وشەی (دین) بە مانای دەسەڵاتی هەرمبەرز هاتوە، ئینجا بە مانای ملکەچی بۆ ئەو دەسەڵاتەو بەگوێ کردنی و بەندایەتی کردنی، مەبەستیش لە (اخلاص الدین لله) ئەوەیە کە بنیادەم بە فەرمانڕەوایی و فەرمانی هیچ کەسێك رازی نەبێت جگە لە خودا، وە گوێڕایەڵی و بەندایەتیەکەشی پاك و سەرڕاستانە بۆ خوا یەکلا بکاتەوە بە جۆرێك دوای بەندایەتیکردنی خودا بەندایەتی کەسی تر نەکاو گوێڕایەڵی کەسێکیش نەکا کە خودا پێی ناخۆش بێ .(١)

## بەکارهێنانی ( دین ) بەمانای سێیەم

ـ ﴿ قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِن كُنتُمْ فِى شَكٍّ مِّن دِينِى فَلَآ أَعْبُدُ ٱلَّذِينَ تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلَٰكِنْ أَعْبُدُ ٱللَّهَ ٱلَّذِى يَتَوَفَّىٰكُمْ ۖ وَأُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٠٤﴾ وَأَنْ أَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴾ یونس/١٠٥،١٠٤. واتە : بڵێ : ئەی خەڵکینە، ئەگەر ئێوە گومانتان هەیە لە راستی ئایینەکەم، ئەوا من ئەو بتانە ناپەرستم کە ئێوە لەباتی خوا دەیانپەرستن! کە زیان و قازانجیان نیە، بەڵکو ئەو خودایە دەپەرستم کە دەتانمرێنێ و هەر ئەو قازانج و زیانی بەدەستە و فەرمانم

---

(١) مەبەستی ئەوەیە گوێڕایەڵی کردنی غەیری خوا (هەر شتێك بێ) هەر دەبێ لە چوارچێوەی گوێڕایەڵیکردنی خوادا بێت. وەك گوێڕایەڵی کردنی منداڵ بۆ باوك و دایکی یا بەندەیەك بۆ گەورەکەی، یا ئافرەت بۆ مێردەکەی ئەگەر لە چوارچێوەی شەرعی خوادا بێت ئەوا گوێڕایەڵی کردنی فەرمانی خوایە، ئەگەر لەو چوارچێوەیە دەرچو ئەوە یاخیبون و دەرچونە لە یاسای خوا.

ئەمە لە گوێڕایەڵیکردنی حکومەتیشدا هەر وایە، چونکە ئەگەر ئەم حکومەتە لەسەر یاسای خوا بنیات نرابێ ئەوا گوێڕایەڵی کردنی پێویستە، بەڵام ئەگەر لەسەر یاسا دانراوەکانی بنیادەم (القوانین الوضعیة) دا بنیات نرابو ئەوا گوێڕایەڵی کردنی تاوان و دەرچونە لە گوێڕایەڵیکردن و فەرمانی خوای گەورە.

پێکراوه کە لە ئیمانداران بم. هەمیشە پاك و سەرڕاستانە رو لـە ئـایینی خـوا بکەو رو لە هەمو رێبازێکی تر وەرگێڕەو لە هاوەڵ بڕیاردەران مەبە.

ـ ﴿إِنِ ٱلۡحُكۡمُ إِلَّا لِلَّهِۚ أَمَرَ أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلۡقَيِّمُ﴾ یوسـف/٤٠ واتـە : حوکم و فەرماندان بە پەرستن و هەڵسوڕان و ویست و موڵکایـەتی و ئاراستەکردن تەنها بەدەست خودایەو فەرمانی کردوە کە بە تەنها ئەو بپەرستن ، ئەمەیە ئـایینی راست و دروست.

ـ ﴿وَلَهُۥ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ كُلّٞ لَّهُۥ قَٰنِتُونَ﴾ الـروم/٢٦ واتـە : هەرچی لە ئاسمانـەکان و زەویدایـە لـە موڵك و وەدیهێنـان و هەڵسوڕاندن هـەموی هـی خودایەو هەموی فەرمانبەر و ملکەچی ئەون.

ـ ﴿ضَرَبَ لَكُم مَّثَلٗا مِّنۡ أَنفُسِكُمۡۖ هَل لَّكُم مِّن مَّا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُكُم مِّن شُرَكَآءَ فِي مَا رَزَقۡنَٰكُمۡ فَأَنتُمۡ فِيهِ سَوَآءٞ تَخَافُونَهُمۡ كَخِيفَتِكُمۡ أَنفُسَكُمۡۚ﴾ الـروم/٢٨ واتـە : خودای گەورە نمونەیەکی لە خۆتانەوە بۆ هێناون، ئایا ئێوە رازیـن بـەوەی کـە ژێردەست و کۆیلەکانتان هاوبەش و برابەشتان بن لەو ماڵەی کە خودای گەورە کردویەتی بە رزق و رۆزیتان و تیایدا یەکسان بـن؟ حەتمـەن رازی نـابن. باشـە کـە بـۆ خۆتـان رازی نـەبن چـۆن رازیـن بـەوەی خـودای گـەورە لـەو موڵـك و دەسـەڵاتەی هەیـەتی هاوبەشـی هـەبێت ؟ کـاتێ کـە ئێـوە لەژێردەسـتەکانتان ناترسن لەسەرانی ئازادەکان دەترسن.

ـ ﴿بَلِ ٱتَّبَعَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓاْ أَهۡوَآءَهُم بِغَيۡرِ عِلۡمٖۖ﴾ الـروم/٢٩ واتـە: ئەوانـەی ستەمیان کرد نەزانانە شوێنی هەواو ئارەزوی خۆیان کەوتن.

ـ ﴿ فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا ۚ فِطْرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِى فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيْهَا (١) لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴾ الروم/٣٠ واتە: سەرڕاستانە لاكە بە لای حەقەوەو رو بكە ئەو ئایینە راستەو خۆت لە هەرچی رێچكەی خواروخێچ هەیە لابدە، ئاینی خودا لەگەڵ سروشتی مرۆڤەكاندایە، خودای گەورە سروشتی مرۆڤی وا بەدیهێناوە كە یەكتاپەرست بێ، گۆڕینی دەسكردی خودا بە هیچ شێوەیەك ماف و تواناو بواری نیە، ئا ئەمەیە ئایینی راست و دروست، بەڵام زۆربەی خەڵكی نازانن.

ـــــــ ﴿ ٱلزَّانِيَةُ وَٱلزَّانِى فَٱجْلِدُوا۟ كُلَّ وَٰحِدٍ مِّنْهُمَا مِا۟ئَةَ جَلْدَةٍ ۖ وَلَا تَأْخُذْكُم بِهِمَا رَأْفَةٌ فِى دِينِ ٱللَّهِ ﴾ النور/٢ واتە : سەد قەمچی لە هەریەك لە زیناكەرانی مێیینەو نێرینە بدەن، لە جێبەجێكردنی حوكمی خودا بەزەییتان نەیاتەوە..

ـــــــ ﴿ إِنَّ عِدَّةَ ٱلشُّهُورِ عِندَ ٱللَّهِ ٱثْنَا عَشَرَ شَهْرًا فِى كِتَٰبِ ٱللَّهِ يَوْمَ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ مِنْهَآ أَرْبَعَةٌ حُرُمٌ ۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ ﴾ التوبة/٣٦ واتە : بێگومان لەو رۆژەوە خودای گەورە ئاسمانەكان و زەوی دروست كردوە بە پێی سوڕانەوەی مانگ دوازدە مانگی داناوە بۆ حیساب و حوكمی شەرعی، لەوانە چوار مانگیان حەرامن، واتە گەورەو رێزلێگراون و جەنگیان تێدا حەرامە، كە بریتین لە زولقیعدەو زولحیجەو موحەڕەم و رەجەب.. ئەمەیە ئایین و یاساو دەستوری دروست و تەواو.

---

(١) واتە ئەو سروشت و تەبیعەتەیە یا ئەو غەریزەیەی كە خوای گەورە مرۆڤی لەسەر بنیات ناوە، كە ئاینی پێویستەو زوش باوەڕ بەوە دەكا كە خوای گەورە لە بەدیهێنانی مرۆڤ و رۆزیدانی و كارهەڵسوڕانی هیچ هاوەڵی نیە، پێچەوانەی شەرعی خوا هیچ پەرستن و گەورەیی و گوێڕایەڵیەك بۆ هیچ مرۆڤێك نیە. جا رێگەی راستی مرۆڤ ئەوەیە كە تەنها بەندەی خوا بێ و بەندەی كەسی دی نەبێ .

- ﴿كَذَٰلِكَ كِدْنَا لِيُوسُفَ مَا كَانَ لِيَأْخُذَ أَخَاهُ فِي دِينِ ٱلْمَلِكِ﴾ يوسف/٧٦ واتە : ئاوا تەگبیرمان بۆ یوسف کرد تا بتوانێت براکەی لای خۆی بهێڵێتەوە، چونکە بە پێی یاسای پاشای میسری ئەو سەردەمە نەیدەتوانی بیگرێت، لەبەر ئەوەی یاسای سزادانی دزی لای ئەو پاشایە وابو کە لە دزەکە بدرێت و دو قاتی ئەوەشی کە دزیویەتی لێی بسەنرێتەوە.

ـــ ﴿وَكَذَٰلِكَ زَيَّنَ لِكَثِيرٍ مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ قَتْلَ أَوْلَٰدِهِمْ شُرَكَآؤُهُمْ (١) لِيُرْدُوهُمْ وَلِيَلْبِسُوا (٢) عَلَيْهِمْ دِينَهُمْ﴾ الأنعـــام/١٣٧ واتـــە: ئەوانەی کە لەگەڵ خودا کردبویاننە خوا، کوشتنی منداڵەکانیان لەلا پەسەند کردبون! وەك ئەوە کە پێیان بڵێن پیاوەتی لە زیندە بەچاڵکردنی کچاندایە، یا لە قوربانی کردنی کوڕاندایە بۆ بتەکان. ئەمەش بۆ ئەوەی بە هیلاکیان بدەن و ئایینەکەیان لێ تێکەڵ و پێکەڵ بکەن.

ـ ﴿أَمْ لَهُمْ شُرَكَٰٓؤُا شَرَعُوا لَهُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَنۢ بِهِ ٱللَّهُ﴾ الشـوری/٢١ واتە : یان چەند هاوەڵێکیان هەیە لە شەیتانەکان و بتەکان کە کردویانن بە هاوبەشانی خودا کە یاساو رێسای وایان بۆ دادەڕێژن کە خودا مۆڵەتی پێ نەداوەو پێی رازی نیە ؟

---

(١) مەبەست ئەو پیاوماقوڵ و سەرکردانەیان بون کە لە حوکم و فەرمان دەرکردن و یاسادانانیدا کردبویانن بە هاوەڵی خوا.

(٢) مەبەست لە ( لبس )ی ئایین ئەوەیە کە ئەو یاسادانەرە درۆزنانە ئەو تاوانەیان لەلا خۆشەویست دەکەن تا وایان حاڵی کەن ئەمە بەشێکە لە ئاینی پێغەمبەر ئیبراهیم و ئیسماعیل سەلامی خوایان لێ بێ .. وەکو ئەو مەلا دین فرۆشانەی کوفرو فسقی فەرمانڕەوا بێ دینەکان دەشەرعێنن!!

- ﴿ لَكُمۡ دِينُكُمۡ وَلِيَ دِينِ ﴾ الكافرون/٦ واته : ئايينی خۆتان (كه داب ونه‌ریت‌و یاساو ده‌ستورتانه) بۆ خۆتان و یاساو ده‌ستوری خۆشم بۆ خۆم.

مه‌به‌ست له وشه‌ی (دین) له‌و ئایه‌تانه‌ی سه‌ره‌وه‌دا ئه‌و یاساو ده‌ستورو رێبازو سیستمه فیكری و كرداریه‌یه كه مرۆڤ خۆی پێوه ده‌به‌ستێته‌وه. جا ئه‌گه‌ر ئه‌و ده‌سه‌ڵاته‌ی مرۆڤ پشتی پێ ده‌به‌ستێ بۆ جێبه‌جێكردنی ده‌ستور یان سیستمێكی ژیان، به پێی شه‌رعی خودا بێ ئه‌وا بێگومان ئه‌و كه‌سه له دینی خودادایه‌و ئه‌گه‌ر ئه‌و ده‌سه‌ڵاته ده‌سه‌ڵاتی پاشایه‌ك بێت ئه‌وا ئه‌و كه‌سه له دینی پاشاكه‌دایه.. ئه‌گه‌ر ده‌سه‌ڵاتی قه‌شه‌و شێخه‌كان بێت ئه‌وا ئه‌و كه‌سه له دینی واندایه، هه‌روه‌ها ئه‌گه‌ر ئه‌و ده‌سه‌ڵات و ده‌ستور و یاسایه ده‌سه‌ڵاتی خێزان یان هۆز و تیره یا جه‌ماوه‌ر بێت ئه‌وا ئه‌و كه‌سه بێ گومان له دینی ئه‌واندایه.

به كورتی ئه‌وه‌ی پشت و په‌نای به یه‌كێك ببه‌ستێت و به به‌رزترین پاڵپشتی دابنێ و له رێبازی فیكری و عه‌مه‌لیدا شوێنی بكه‌وێ و هه‌موو حوكمێك له‌و وه‌رگرێ و به به‌رزترین حوكمیشی دانێ، ئینجا به پێی ئه‌و حوكم و پشت پێ به‌ستنه‌ی رێگایه‌ك دیاری بكات و له ژیاندا بیگرێته به‌ر، ئه‌وه دینی ئه‌و كه‌سه بێگومان بریتیه له‌و به‌رنامه‌و رێبازه‌و ئه‌و كه‌سه‌ش به بێ هیچ گومان و راڕاییه‌ك له شوێنكه‌وته‌ی ئه‌و دینه (كه به‌رنامه‌و رێبازی ژیانێتی) دێته هه‌ژمارد.

## وشەی ( دین ) بە مانای چوارەم

ـــ ﴿ إِنَّمَا تُوعَدُونَ لَصَادِقٌ ﴿٥﴾ وَإِنَّ الدِّينَ لَوَاقِعٌ ﴾ الـــذاريات/٥-٦ واتـــه : ئـــەوەی بەڵێنتان پێدراوە راستەو درۆی تێدا نیە. رۆژی موحاسەبەو سزاو پاداشت هەر دێتە پێش.

ـ ﴿أَرَءَيْتَ الَّذِي يُكَذِّبُ بِالدِّينِ ﴿١﴾ فَذَٰلِكَ الَّذِي يَدُعُّ الْيَتِيمَ ﴿٢﴾ وَلَا يَحُضُّ عَلَىٰ طَعَامِ الْمِسْكِينِ ﴾ الماعون/١-٣ واتـه : ئایا دەزانـی ئـەو كەسـە كێیـە كـە هەبونی رۆژی لێپرسینەوەو سزاو پاداشت بـەدرۆ دەخاتـەوە كێیـە ؟ ئـەوە ئـەو كەسەیە كـە پـاڵی بـە منـداڵی هـەتیوەوە هێنـاوەو سوكایەتی پـێ كـردوە.. ئـەو كەسـەی بـە تونـدو تیـژیی لەگـەڵ هەتیوانـدا دەجوڵێتـەوەو ستـەمیان لێـدەكات تـاوانی وەكـو تـاوانی ئـەو كەسـە قورسـە كـە بـاوەڕی بـە زیندوبونـەوەی رۆژی دوایی نیە.

ـ ﴿وَمَا أَدْرَاكَ مَا يَوْمُ الدِّينِ ﴿١٧﴾ ثُمَّ مَا أَدْرَاكَ مَا يَوْمُ الدِّينِ ﴿١٨﴾ يَوْمَ لَا تَمْلِكُ نَفْسٌ لِّنَفْسٍ شَيْئًا ۖ وَالْأَمْرُ يَوْمَئِذٍ لِّلَّهِ) الأنفطار/١٧-١٩ واته : تۆ چوزانیت كە رۆژی پرسینەوەو سزاو پاداشت چیە؟ پاشان تۆ چوزانیت كە رۆژی پرسینەوەو سزاو پاداشت چیە؟! ئەوێ رۆژێ ئەو رۆژەیە كە كەس بە هانای كەسی ترەوە ناچێت و كەس خاوەنی هیچ دەسەڵاتێك نیە.. هەمو شتێكی ئەو رۆژە بە دەست خودای گەورەیە.

دیـارە كـە وشـەی (دیـن) لـەو ئایەتانـەدا بـە مانـای لێپرسـینەوەو پاداشـت دانەوەو سزا دان وبڕیار دەركردن هاتوە.

## بەکارهێنانی ( دین ) وەکو زاراوەیەکی گشتگیر

تا ئێرە قورئان وشەی (دین)ی بەو شێوەیە بەکارهێناوە کە نزیك بێت لەو مانایانەی باوبون لەناو عەرەبەکاندا، بەڵام لەوەدوا دەبینین کە بەشێوەی زاراوەیەکی گشتی و هەمەلایەنی (الجامع الشامل) بەکاردێنێ. کە مەبەستی پێ بەرنامەو یاساو رێساو سیستەم هەمەلایەنەی ژیانە، کە مرۆڤ تیایدا بۆ دەسەڵاتێك، هەر دەسەڵاتێك بێت، ملکەچ دەبێت ئینجا گوێڕایەڵی دەکات و پەیڕەوی لە دەستورو یاساو رێ ورەسمی ئەو دەسەڵاتە دەکات و پاشان سەرەنجامی پابەندبون و گوێڕایەڵیی و سڵ کردنەوەی لە هەڕەشەی سەرپێچی کردنی لە فەرمان و دەستورو یاساکانی، چاوەڕێی خەڵات و بەرزبونەوەی پلەوپایەی دەکات.

رەنگە لە هیچ زمانێکدا زاراوەیەك نەبێت بەو گشتگیری و هەمەلایەنیەوە ئەو هەمو چەمك و مانایە لەخۆ بگرێت. نزیکە وشەی (State) خۆی لە قەرەی ئەو چەمکە بدات، بەڵام ئەوەندە فراوان نیە تا هەمو ماناکانی (دین) بگرێتە خۆی، بەڵکو پێویستی بەوە هەیە کە چوارچێوەی چەمکەکەی فراوانتر بکرێت بۆ ئەوەی بگاتە سنوری هەمو ئەو مانایانە.

لەو ئایەتانەی خوارەوەدا وشەی (دین) بەو زاراوە بەرفراوان و گشتی و هەمەلایەنیە بەکارهاتوە:

ـــ ﴿ قَٰتِلُواْ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَلَا بِٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَلَا يُحَرِّمُونَ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَلَا يَدِينُونَ دِينَ ٱلۡحَقِّ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ حَتَّىٰ يُعۡطُواْ ٱلۡجِزۡيَةَ عَن يَدٖ وَهُمۡ صَٰغِرُونَ ﴾ التوبة/٢٩ لە رستەی ﴿لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ ﴾ وشەی (دین) بەمانای یەکەم و دوەم بەکار هاتوە، لە رستەی ﴿وَلَا بِٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ ﴾ دین

بەمانای چوارەم و لە رستەی ﴿وَلَا يُحَرِّمُونَ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ﴾ دین بـە مانـای سێیەم بەكارهاتوە.

واتە : جەنگ لەگەڵ ئەوانەدا بكەن كە باوەڕێكی راست و دروستیان بەخواو رۆژی دوایـی نیـەو ئـەو شـتانە بەحـەرام نـازانن كـە خـودا و پێغەمبەرەكـەی حەرامیان كردوە و شوێن دیـنی راسـت و حـەق ناكـەون كـە ئیسلامە، لەوانـەی خاوەن كتێبە ئاسمانیەكانن، هەتا ملكەچانە باجی خۆیان دەدەن.

(دیـن الحـق) لـەو ئایەتـەدا وشـەیەكی زاراوەییـە خـودای بالادەسـت خـۆی دایناوەو لـەو سـێ رسـتەیەی هێڵمـان بـە ژێـردا كێشاون ماناكـەی لێكداوەتـەوە، (دین الحق) گوزارشـتی لـە هەرچوار ماناكـەی دیـن كـردوەو لـەو یـەك ئایەتـەدا باسی كردون.

ــ ﴿وَقَالَ فِرْعَوْنُ ذَرُونِىٓ أَقْتُلْ مُوسَىٰ وَلْيَدْعُ رَبَّهُۥٓ ۖ إِنِّىٓ أَخَافُ أَن يُبَدِّلَ دِينَكُمْ أَوْ أَن يُظْهِرَ فِى ٱلْأَرْضِ ٱلْفَسَادَ﴾ غافر/٢٦ واتە : فیرعەون بە دارودەستەكەی گوت : لێم گەڕێن تا موسا بكوژم ، ئەویش بـا هـاوار كاتـە خوداكـەی خـۆی تـا رزگـاری كات لە دەستم، من دەترسم دینەكەتان لێ بگۆڕێ یـان ئـاژاوەو ئاشـوبگێڕیی لـە میسردا بنێتەوە.

ئەگەر سەرنجی چیرۆكی سەیدنا موسا سەلامی خودای لێ بێت و فیرعـەون لە قورئاندا بدەین ئەوا هیچ گومانێك لـەوەدا نـامێنێ كـە وشـەی (دیـن) تـەنها بـەمانای چـەند دروشمێكـی پەرسـتنی ئـایینی نـەهاتوە، بـەڵكو مەبەسـت لێـی دەوڵەت و یاساو رێسای شارستانیشە. جا ئەوەی فیرعەون لێی دەترسا ئـەوە بـو ئەگـەر موسـا سـەلامی خـودای لـێ بێـت لـە بانگەوازەكەیـدا سـەركەوێ ئـەوا دەوڵـەتو دەسـتوری وڵاتـی دەكەوێتـە دەسـت و رەگ و ریشـەی یاسـاو رێسـاو

نەریتە فیرعەونیەکان لە بناغەوە هەڵدەکێشرێت، ئینجا دەیخستنە سەر ئەو خەمەی کە یا ئەوەتا لە جێگەی دەستورەکەی فیرعەوندا یاسایەکی جیا دێنێتە کایەوە یا ئەوەتە دەوڵەت لە بەرەڵایی و بێ یاساییدا دەژییێت و جۆرێك لە پاشاگەردانی و بێ سەرەو بەرەیی سەرزەمینی فیرعەونیەکان داگیر دەکات.

- ﴿ إِنَّ ٱلدِّينَ عِندَ ٱللَّهِ ٱلْإِسْلَٰمُ ﴾ آل عمران/١٩ واتە : ئەو دینەی کە خودا پێی رازییە کە ببێتە دەستورو یاسا بۆ هەمو لایەنەکانی ژیانی مرۆڤ تەنها ئیسلامەو بەس.

ــ ﴿ وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ ٱلْإِسْلَٰمِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ ﴾ آل عمران/٨٥ واتە : هەر کەسێك جگە لە ئیسلام سیستم و دەستورو یاسایەکی ژین بگرێتە بەرو پەیڕەوی لێ بکات دوای ئەوەی خودای گەورە (موحەممەد) ﷺ ی ناردوە، ئەوە لێی وەرناگرێت.

ــ ﴿ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَرْسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلْهُدَىٰ وَدِينِ ٱلْحَقِّ لِيُظْهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْمُشْرِكُونَ ﴾ التوبة/٣٣ واتە : خودایەیە کە پێغەمبەرەکەی بە رێنمایی و ئایینی حەق و راستەوە ناردوە (کە ئیسلامەو هەمو کون و کەلەبەرێکی ژیان دەگرێتەوەو چونکە گشتگیرو تەواوە) نەخشە بۆ دانراویشە کە دەبێ بەسەر هەمو ئایینێکدا زاڵ ببێ، با کافرو هاوەڵپەیداکەرانیش پێیان ناخۆش بێت.

- ﴿ وَقَٰتِلُوهُمْ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ ٱلدِّينُ كُلُّهُۥ لِلَّهِ ﴾ الانفال/٣٩ واتە : ئەی ئیمانداران جەنگ لەگەڵ کافرو هاوەڵپەیداکەراندا بکەن تا نەبنە هۆی پاشگەزکردنەوەی خەڵکی لە ئایینەکەی خوداو هاوەڵپەیداکردن

(شیرك)[١] بلاونەبێتەوەو پەرە نەستێنێ و تا دەستورو یاسای ژیان هەر دینەکەی خوا بێت.

- ﴿إِذَا جَآءَ نَصۡرُ ٱللَّهِ وَٱلۡفَتۡحُ ۝١ وَرَأَيۡتَ ٱلنَّاسَ يَدۡخُلُونَ فِي دِينِ ٱللَّهِ أَفۡوَاجٗا ۝٢ فَسَبِّحۡ بِحَمۡدِ رَبِّكَ وَٱسۡتَغۡفِرۡهُۚ إِنَّهُۥ كَانَ تَوَّابَۢا﴾ النصـــر/١-٣ واتـــە : هـەر کـاتێ سـەرکەوتنی خـودا گەیشـتە ئێـوە و بەسـەر دوژمنەکانتانـدا زاڵبـون (لێـرەدا بەمەبەسـتی رزگـارکردنی شـاری مەککەیـە) دەبـینی کـە تـیرەو هـۆزە عارەبەکان پۆل پۆل دێنە نـاو ئیسلام، جا لـەو کاتانـەدا زۆر یـادی خـودا بکـەو داوای لێخۆشـبونی لـێ بکـە، بەراسـتی ئـەو تۆبـە قبـوڵ دەکـاو زۆر بـەزەیی بـە بەندەکاندا دێتەوە.

مەبەست لە وشەی (دیـن) لـە هـەمو ئـەو ئایەتانـەدا بریتیـە لـە یاسایەکی تێـرو تەسـەل و هەمەلایەنـەی ژیـان لـەبارەی بیروبۆچـون و لایـەنی فیکـری و رەوشتی و کرداریەوە.

خودای گەورە لە دو ئایەتی یەکەم و دوەمدا رایگەیانـدوە کـە یاسـای قبـوڵ کراو و پەسند لای خودا ئەو یاسا ونیزامەیـە کـە لەسـەر بنـەمای بەندایـەتی و پەرستن و گوێڕایەڵی کردنی ئەو بنیات نرابێ، بەڵام هـەر یاسـایەك کـە لەسـەر گوێڕایەڵی کردنی دەسەڵاتێك کە پەیڕەوی لە یاسای خـودا نـەکا بنیـات نرابـێ، ئـەوا رەت دەکرێتـەوەو لای خـودا وەرنـاگیرێ، چـونکە شـتێکی سروشـتیە کـە خودای گەورە بە یاساو دەسـتورێکی دی رازی نـابێ، لەبـەر ئـەوەی مـرۆڤ خـۆی خوڵقاوی خودایەو پەروەردەی دەستی خودایەو لە مەملەکـەتی خـودادا دەژی و ژیانەکەی وەکو ژیانێکی ژێردەستی گەورەیەکە، بۆیە نابێ سەر بۆ غەیری ئـەو

---

[١] ئیبن عەباس خوا لێی رازی بێت دەفەرموێت: (فتنه) لێرەدا بە مانای (شرك) ە .

ئەوی بکاو بە گوێیان بکات یان شوێن کەسێکی تر بکەوێت و بەندایەتی بۆ بکات، یان بەرنامەی لایەنێکی تر وەرگرێ.

لە ئایەتی سێیەمدا فەرمویەتی کە پێغەمبەرەکەی ناردوە بە خۆی و بەم شەرعە پاکەوە کە ئیسلامە، مەبەستەکەشی ئەوەیە کە جێگەی هەمو رێ وشوێن و دەستورەکانی تری ژیان بگرێتەوەو ببێتە تاکە یاساو پەیامی مرۆڤایەتی.

لە ئایەتی چوارەمدا خودای گەورە فەرمان دەکا بە ئیمانداران کە کوشتار بکەن لەگەڵ هەمو هاوەڵپەیداکەرانی سەرزەوی تا دەسەڵاتی هاوەڵپەیداکردن کۆتا دێ.. بە دەربڕینێکی تر تا هەمو یاسایەك کە لە خودا یاخییە نەمێنێ و بەندایەتی و گوێڕایەڵی کردن تایبەت دەبێ تەنها بۆ خودای پەروەردگار.

لە ئایەتی کۆتاییدا کە ئایەتی پێنجەمە، خودای گەورە رو بە پێغەمبەرەکەی دەفەرموێت: کاتێك کە دوای هەوڵ و تێکۆشانی بێوچانی ماوەی بیست و سێ ساڵە، شۆڕش و گۆڕانکاریی ئیسلامی روی داو، ئیسلام بە هەمو بەشەکانیەوە جێگەی گشت یاسا فیکری و رەوشتی و پەروەردەیی و شارستانی و کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابورییەکانی ئەو هاوەڵپەیداکەرانەی گرتەوەو نوێنەری عەرەبەکان لە هەمو لایەکەوە دەستەدەستە هاتن بەرەو ئیسلامەکە، ئەو کاتە نیشانەی ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ پەیامی راسپێردراوی خودای مەزنی بە تەواوی گەیاندوەو ئەو بارەی سەرشانی دەگەیەنێتە جێگەی دیاریکراوی خۆی، لەو کاتەدا خودای گەورە پێی دەفەرموێ : وا نەزانیت کە ئەم کارە مەزن و گەورەیە بە شان و شەوکەت و دەسەڵاتی خۆت تەواو بوە ئەی موحەممەد، لەخۆت بایی نەبی، بەڵکو ئەوەی کە دورە لە کەموکوڕی و بێدەسەڵاتی و پاك و بێ خەوشە و هەمو سیفەتێکی تەواوی هەیە تەنها

خودایه، ده تۆش دان به بێ لەکەیی خودادا بنێ و له هەمو کەموکورتیەك بە دوری بگرەو لەسەر پشتگرتن و دەستگرتن و یارمەتیدان و سەرخستنت سوپاس و شوکرانەبژێری بکه.. به پشتیوانی ئەو بو سەرەنجام توانیت ئەو ئەرکە گەورەو گرنگە رابگەیەنیت و تەواوی بکەیت، داوای لێبکە و بڵێ : خودایه لەو کەموکوڕیانەم ببورە کە لەکاتی بەجێ هێنانی ئەرکی سەرشانمدا لەماوەی بیست و سێ ساڵی خەباتی پێغەمبەرێتیمدا دەرکەوتون لێمەوە.. خوایه چاوپۆشیم لێ بکە.

دوا وشەی ئێمەش:

الحمد لله رب العالمين

# پاشكۆيەكى كورت

## بۆ دو تێبینی گرنگ لەسەر وشەی (دین)

یەکەم:لە زمانی عەرەبیدا هەندێك وشە هەن پێیان دەڵێن (کلمات الاضداد) واتە: ئەو وشانەی مانایەك و دژە ماناکەی دەدەن.. بۆ نمونە وشەی (مولى) واتە (السيد والمطاع) واتە گەورەو فسەرۆیشتو، کەچی لە هەمان کاتدا دەوترێت (بلال مولي أبي بكر) واتە سەیدنا بیلالی حەبەشی کە کۆیلەی سەیدنا ئەبوبەکری سددیق بو.. خوا لێیان رازی بێت.. وشەکە لە یەك کاتدا مانای خاوەن کۆیلەو کۆیلەکەی دا.

لەم وشانە لە فەرهەنگی (معجم مقاييس اللغة/ ابن فارس) دا زۆر دەبینیت، جگە لەوەی یەکێکی وەکو زانای زمانەوانی عەرەبی ئیبنوسسککیت کتێبێکی سەربەخۆی هەر بەو ناوە (کلمات الاضداد) داناوە.

وشەی (دین)یش وایە.. ئیمامی مەودودی بەڕێز هەردوکیانی هێناومتەوە بەڵام ئاماژەی بەم خاڵە نەکردوە، بڕوانە کە دەفەرموێ :

(لەبەر ئەمەیە کە دەبینی لە قورئاندا وشەی (دین) جێگەی سیستمێکی تەواو دەگرێتەوە کە لەچوار بەش پێك دێت :

١. فەرمانڕەوایەتی و دەسەڵاتی هەرەبەرز.

٢. گوێڕایەڵی وملکەچی بۆ ئەو فەرمانڕەوایەتی ودەسەڵاتە.

٣. یاساو ڕێساو دەستوری سیستمێکی فیکری یان سیاسی یان کۆمەڵایەتی.

٤. موحاسەبەو پرسینەوەو دیاری کردنی سزاو پاداشتی ئەو کارانـەی ئـەنجام دراون..)

دوەم: هەمو ئیسلام لە چوار مانەکەی وشەی (دین)دا کۆ دەبێتـەوە.. مانـای یەکەم ئاماژەیە بۆ (عەقیدەی تەوحید) کە بریتیە لـە ناسینی خـوای کردگـارو پەروەردگار بە ناوە جوانەکان وسیفەتە کامڵەکانی خۆی.مانـای دوەم: ئاماژەیـە بۆ ئەنجامدانی خواپەرستیەکان و نواندنی عەبدایـەتی تـەواو بـۆ خـوای گـەورە بەو شێوازانەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم رونی کردۆتەوە.

مانــای سـێیەم : ئاماژەیــە بـۆ پابەنــدبون بــە شــەریعەتەکەی خــواوە، بــە پاراستنی سنورەکانی حەڵاڵ و حەرامەوە.

مانـای چـوارەم: ئاماژەیـە بـۆ ئـەو چارەنوسـەی رۆژی قیامـەت کـە لەسـەر زانــین و پابەنــدبونی مرۆڤەکانــەوە بــە ســێ ماناکــەی یەکــەمینی دینەکــەوە (عەقیــدە، عیبــادەت، شــەریعەت) دادەمــەزرێت، کــە ســێ مەیــدانی خــودا بەیەکناسـینن. کـەوابو مانـای چـوارەم لەسـەر پابەندبونـە بـە سـێ ماناکـەی یەکەمــەوە، کــابرا ئەگــەر خــودای ناســی و پەرســتیی و پابەنــدبو بــە شــەرعەکەیەوە، شـایانی پاداشـتی خـوا دەبێـت.. ئەگـەر لـە یـەکێك لـەم سـێ مەیدانەی خوا ناسیندا کەمتەرخەم بو، شـایانی سـزا دەبێـت.. لـەم روانگەوەیـە کـە (یـوم الـدین) ناشـێت بکرێتـە: رۆژی دوایـی، یـان رۆژی قیامـەت، یـان رۆژی پرسینەوە.. چونکە پرسینەوە بەشێکە لە مانای چوارەمی دین.

دەشـێت مانـای یەکـەم و دوەمـیش پێکـەوە گـرێ بدرێنـەوەو ببنـە مانـای خواناسـین، بـە پێناسـەی ئیمـامی ئیبنولقـەییمی جەوزییـە (توحیـد المعرفـة والاثبات)، مانـای سـێیەمیش دەبێتـە پابەنـدبونی ویسـت و ئـیرادەی موسـوڵمان بەو خواناسیەوە کە ئەو ناوی ناوە: (توحیـد الارادة والقصـد). مانـای چـوارەمی

لای ئیمـــامی مـــەودودیش دەبێتـــە مانـــای سـێیەمی دینەکـــە لای ئیمـــامی ئیبنولقەییم کە لای هەردوکیان بریتیە لە ڕۆژی پاداشت دانەوەو سزادان..

ڕەحمـەتی خـوا لـە ئیمامی مـەودودی کـە بـەم نامیلکـە بچوکە نـەوەکانی سـەردەمی خسـتەوە سـەر بایەخـدان بـە زاراوەی قورئـانی و گرێدانـەوەی واتـا جیاوازەکانی و چەسپاندنەوەیان لە واقیعی نوێی ئوممەتەکەدا ..

# پێڕست

وتەیەکی پێویست.......................................... ٦
پێشەکی وەرگێڕی کوردی .................................... ٩
پێناساندنێك .............................................. ١١
ئەبولئەعلای مەودودی لە چەند دێڕێکدا ..................... ١٣
پێشەکی دانەر.............................................. ١٧
گرنگی ئەم چوار زاراوەیە .................................. ٢٠
هۆی سەرەکی ئەم تێگەیشتنە چەوتە .......................... ٢١
ئەنجامەکانی ئەم تێگەیشتنە چەوتە .......................... ٢٥
یەکەم: الالــە ( خودا )...................................... ٢٧
لێکۆڵینەوەی زمانەوانی....................................... ٢٧
بیروبۆچونی نەفامان دەربارەی (الە) .......................... ٢٩
بنەمای بابەتی خودایەتی ...................................... ٣٩
بەڵگەی قورئانی بۆ ئەم مانایە.................................. ٤٠
دووەم: پـەروەردگـار (الرب)..................................... ٥٥
لێکۆڵینەوەی زمانەوانی........................................ ٥٥
١-پەروەردەکردن و پێگەیاندن و گەشەپێدان ................... ٥٥
٢- کۆکردنەوەو کۆمەڵبون و ئامادەکردن ....................... ٥٦
٣- بەڵێنــدان و چـاککردن و چـاودێری و لـە ئەســتۆگرتن و سەرپەرشــتی
کردن ........................................................ ٥٦

٤- پایەبەرزی و گەورەیی و سەرۆکایەتی و فسەرۆیشتن و دەست لە کاروبار وەردان و کاربەجێ بون........................ ٥٧
٥- خاوەندارێتی ........................................ ٥٨
بەکارهێنانی وشەی (الرب) لەقورئاندا.............................. ٦٠
١- بەکارهێنانی بەمانای یەکەم.................................. ٦٠
٢- بەکارهێنانی بەمانای دوەم و هەندێك لەمانای یەکەم ............ ٦١
٣- بەکارهێنانی بەمانای سێیەم .................................. ٦٢
٤- بەکارهێنانی بەمانای چوارەم و هەندێکیش لە مانای سێیەم ........ ٦٢
٥- بەکارهێنانی بەمانای پێنجەم .................................. ٦٤
تێروانینی نەتەوە گومراکان سەبارەت بە پەروەردگارێتی.................. ٦٦
نەتەوەی سەیدنا نوح سەلامی خودای لێ بێت ...................... ٦٦
عاد (نەتەوەی سەیدنا هود) سەلامی خودای لێ بێت.................. ٧٠
سەمود (نەتەوەی سەیدنا سالح) سەلامی خودای لێ بێت ............. ٧١
نەتەوەی سەیدنا ئیبراهیم سەلامی خودای لێ بێت .................... ٧٣
نەتەوەی (لوط) سەلامی خودای لێ بێت............................ ٨٢
نەتەوەی شوعەیب سەلامی خودای لێ بێت ......................... ٨٥
فیرعەون و دەست و پێوەندەکانی..................................... ٨٨
جولەکەو دیانەکان ................................................ ١٠٦
هاوەڵپەیداکەرانی عەرەب ........................................... ١١١
بانگەوازی قورئان دەربارەی پەروەردگاریەتی خودای گەورە.............. ١٢٠
سێیەم: پەرستن (العبادە) ............................................ ١٣٢
لێکۆڵینەوەی زمانەوانی............................................... ١٣٢
بەکارهێنانی وشەی (العبادە) لە قورئاندا.............................. ١٣٥
مانای یەکەمی عیبادەت: بەندایەتی و گوێڕایەڵی کردن................ ١٣٧
مانای دوەمی عیبادەت: بەگوێ کردن و گوێڕایەڵیکردنی (الطاعة) ..... ١٤٠

ماناى سێيەمى عيبادەت: بەخودا دانان (التألە) ........................ ۱٤۳
پەرستن بەهەر سێ ماناى بەندايەتى و گوێڕايەڵيکردن و بەخودا دانان...... ۱٤۹
پاشکۆيەکى کورتى وەرگێڕ................................................ ۱٦۱
چوارەم: ئايين (الدين) .................................................. ۱٦۲
لێکۆڵينەوەى زمانەوانى.................................................. ۱٦۲
بەکارهێنانى وشەى (دين) لە قورئاندا...................................... ۱٦٦
بەکارهێنانى وشەى (دين) بەماناى يەکەم و دووەم......................... ۱٦۸
بەکارهێنانى (دين) بەماناى سێيەم ....................................... ۱۷۰
وشەى (دين) بە ماناى چوارەم............................................ ۱۷۵
بەکارهێنانى (دين) وەکو زاراوەيەکى گشتگير ............................ ۱۷٦
پاشکۆيەکى کورت........................................................ ۱۸۲
بۆ دو تێبينى گرنگ لەسەر وشەى (دين) .................................. ۱۸۲